ناوی کتێب: کۆمیدیای کەرایەتی
نووسینی: مەحموود زامدار
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٨٩١
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مریەم موتەقییان
تابلۆی بەرگ: Rorof,I.
چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٨٨٧ی
ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

## پێرست

## شەش

هۆشت هــەبێ... ئەم نامــەیــە

تـەنیا بـاسی (کەر)ی تێدا نییە

زانیت؟

**له بڵاونەکراوەکانی دەزگای کەرایەتی و کەڕبازاڕیی ناوەخۆیی و نێودەوڵەتی**

بۆ موجتەهیدان گەرچی مرخص نییە تەقلید
من موجتەهیدم هاتم و تەقلیدی کەرم کرد
شێخ

## پێشکێشەبە

کەر.

کەرایەتی.

کەریلۆجیا و کەریالیزم.

هەموو کەرێکی بەبار و لەبار و سەردار و بەردار، کە کورتانی لەخاچدراوی ئەم چەرخ و زەمانە بڵحەی هەڵگرتووە و بەدڵێکی پڕ لە ژان و سوێ، بەدەمێکی دادڕاوی پڕ لە پێکەنین، بەقوڕگێکی پڕ لە ئاخ و داخ، بووە و دەبێتە شاهیدی گەورەی موعاناتی ئەم حەزارەتە کەربابە... کەر بە... کەرێ با... شاباش بۆ دیداری کەر.

## سەرزەڕینێ

هەموو گۆرانی و ستران و بەستەی سەیری نێو ئێزگەکان لەلام پەشمە.
هەموو ڕۆمانی دڵداری و شۆڕەسواری لام فشەیە.
هەموو پۆستەچیی دڵداران لە لای مندا بەبێ نرخە.
هەموو فیلمی سینەما و ڤیدیۆ و کاسێت
فەرهادو شیرین، ڕۆمیۆ و جولێت
ماچ و مووچی هەروەك چوكلێت
هۆمۆ سێکسی نێو ئینتەرنێت
مایەی پڕخەن، مایەی لرخەن، مایەی قرخەن
خۆم لە قوڕە چەوری کارەساتی، ئەم گەردوونە قوڕمساخە، دروست کرام
کەچی، دڵم، پۆڵایە، بەردە، ئاسنە
مانای ئەڤین، مانای لەش و ماچ نازانم
ئەوەی جێگەی شانازیمە
مایەی مەزنی و سەربەرزیمە
تەنیا زەڕینی کەرێکە و قەوچەقەوچی ماکەرێکە...!

## بەناوی جەنابی عالی کەری ڕێزدارەوە

کەر دەعبایەکی هێمن و هەژار و ناکامە و "مع سبق الاصرار"یش گەوج و تڕەفام و گەلۆرە. دانیشتووانی کەر لە سەر ڕووی گۆی زەوی بەپێی "احصائیە"یەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە نایەکگرتووەکان و یۆنسکۆ (٦٥ ) ملیۆن کەرە و بەسەرپشتی پانوپۆڕی کیشوەرەکان دابەش کراون. تەنیا و بەس (١٥) ملیۆنیان لە "چین"دا دەژین، ژمارەیەکی زۆریش لە مەکسیك و ئێران و تورکیا و هیندستان و باشووری ئەفریقا و دەوروبەری "دەریای سپی" یان بەزەرەزەر شڵەژاندووە، بەلام کەری کوردستان بەمەشوورترین و گوێدرێژترین و بەئەرکترین کەرانی جیهانی ڕاپەڕیو دەژمێردرێ. چیرۆکنووسێکی بێ سۆپەر دەڵێ: "لە مەکسیك گەر یەکێ بیەوێ ئیجازە وەرگرێ بۆ پەیداکردنی ئیشێك، دەبێ سێ وێنەی خۆی و شەش وێنەی کەرێك بداتە کەربەدەستان تا ئیجازەکەی پێ ڕەوا ببینن!!"

بەهەرحاڵ! بەرزاییی کەر نزیکەی (٨٠ – ١٩٠) سانتیکەر دەبێت، قوورساییەکەی لە نێوان (٣٥٠–٤٥٠) کیلۆکەردایە، نزیکەی (٢٥–٣٠) ساڵیش، کەر چەرخی چەپکەر لێی گەڕێ، لە سات و چرکەکانی کەرایەتی، لەم دنیا کەر گەڕەدا! دەژی!! تا ئێستا (٦) ملیۆنی ئەو هەموو کەرانە هێشتا ماڵی نەبوون و تەکنولۆژیای کەرجسنیش نەیتوانیوە غەریزەیکەرانەیان بگۆڕێت و بیانخاتە نێو بەهەشتە پڕ لە قەرسیلەکەی شارستانییەتی زەق و ڕەق و تەقی ئەمڕۆ! بەواتایەکی تریش: گەر بێتو هەموو کەرەکانی جیهان لە کەرستانێکدا کۆ بکرێنەوە. کۆمارێکی کەرانەی مانەندی کۆمارەکەی کەرە ئەفلاتوونی لێ دەرسکێ... نازانم! پەنتاگۆنی گونداری لەمەڕ ئەمریکا لەم بارەیەوە چ ڕایەکی کەرانەی تری هەیە، یا نا؟ دەبا ئەوان و هەموو کەرپەروەرانی جیهان گوێ بۆ ئەم ڕازەی شاعیری کەرامێزی فەرەنگستان،

(فرەنسیس گام) و لە چامەی "نوێژێك بۆ چوونە نێو بەهەشت" شل بکەن و ئینجا هەڵوەستەیەکیش لەمەڕ کەرانی ئێمە و کەرانی ترا بکەن و بەرگرییەکی هەر هیچ نەبێ کەرانەش لە مافی خوراوی بکەن:

**کاتێ کە لە ڕۆژێکی جوان و جەژنەواردا دێمە لات و**
**ڕوو لە بەهەشت دەکەم**
**لەو کاتەی کە بەنوێژی نیوەڕۆ. ئەستێرەکان دەجریوێنن**
**گاڵۆکەکەم دەگرمە دەست و دەچمە سەر ڕێگە بەربڵاوەکان**
**بەگوێدرێژە هاوڕێکانم دەڵێم:**
**من فرەنسیس گامم، دەچمە بەهەشت**
**چونکە لە جیهانی خوادا، دۆزەخ نییە**
**وەرن ئەی ئەوانەی هاوڕێکانی ئاسمانی شین**
**بەجووتەی گوێچکەی کوشندەی لەناکاوتان**
**مێشەکەرانە و سیرەمۆزە دەردەکەن.**
**ئۆه! خوایە گیان! هەر پێت دەگەم**
**هەزاران گوێچەکەی ئەو کەرە هەگبە لە پاشۆڵانەم دەکەونە دوا**
**ئەو کەرانەی کە عارەبانەی فسۆس پاڵەوانەکان ڕادەکێشن**
**ئەو کەرانەی کە بەتەنەکە و زبڵ بار دەکرێن**
**نەخاسمە ئەو ماکەرانەی کە تینگاتینگن و**
**بەئازار و ژانەوە، ڕێ دەکەن،**
**ئەو کەرانەی کە مینیپانتۆڵیان لەبەرە و**
**شینە زامەکانیان لە گازی مێشە پیسەکان، داپۆشیوە**
**توخوا، خوایە گیان زویر مەبە**
**واز بێنە، با لەتەك ئەم مەخلووقانەی خۆتا**
**بێمە لات!...**

ئەمەیان وا... هەڵهێنێکی کوردانە و کەرانەی لای خۆمانە هەیە و دەزەرمێ: (بەلەش گەورە و گێژ و وێژە، دایك و باوکی گوێدرێژە.) کە من لام وایە چاکترین وەسفێکی هونەرییە بۆ (ڕوخسار و ناوەڕۆك)ی کەری بەستەزمان. دەڵێن: "نێرەکەر باوکی هێسترە، خاڵی ئەسپیش کەرە. با کەسیش گومان لە خۆی نەکا، پەندە و هیچ ترا!" هەرچەندە کلکی کەریش لە کلکی ئەسپ و هێستر و ماین زۆر کورتتر و باریکترە. بەپێی یاسای گەشەکردنی داروین، هەر لەو ڕۆژەوەی کەر پەیدا بووە، تا ئەمڕۆی کەریۆلۆژیا، کەر چ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدیوە. دووریش نییە، قسەی کابرای کوردە هاوجووتەی ئەم تیوریيە نازدارە بێ کە یێژێ: "کەر کەری جارانە و کورتانی گۆڕاوە." هەر بۆیەشە هەر هەموو ڕەگەزەکانی کەرانی مۆزەمبیك و نامیبیا و ناوەڕاستی ئاسیا و ئەفریقا و ئۆناگرا و شیگاتێ و گیانك، بەپێشەنگایەتیی کەرانی وڵاتی ئێمە، هەر یەکن و سەر بۆ یەك جۆرك شۆڕ دەکەن. هەرچەندەش کەری گیانك، دەتوانێ بۆ پتر لە (٤) هەزار مەتر بەرزتر لە ڕووی دەریا بەرزبێتەوە و هەڵشاخێتە سەر شاخە سەختەکانی شۆڕش و شۆڕشگێڕایەتی، گەر بێت و ماینی وڵاتانی خامۆشی بێ شۆڕش، لەو کەرە چاك (چاك+چاك) بکرێت، هێسترێکی زۆر ژیکەرەی لێ دەرسکێ، خۆ گەر بێت و ئەسپی هەر ئەو وڵاتانەش لە ماکەری گیانگی بدرێت، ئەوا (یابۆ)یەکی وای لێ پەیا دەبێت، کە هەموو کەسێکی بەهەوەس (حەیران)ی بێت، بۆ زیاتر ناسینی نەخشەی کەری بلیمەتیش دەبێ بڵێین:

جۆرەکەی: ئەسپینسە

ڕەگەزەکەی: ئیکۆسە

ڕەچەڵەکەی: ئاکوێدایە

پلەکەی: لە تاکەسمەکانە

تیرەکەی: لەمەمکدارەکانە

وڵاتەکەی: کەرستانە

هەروا کەریش وەکو هەموو ئاژەڵە (خەمبارەکان)ی تر موتوربە کراوە و (تصدیر)یش دەکرێ. خۆ ڕەچەڵەکی کەری پواتی و کەتەلۆنیا ناودارترین کەری لێکخشاوی موتوربەکراوە. بچووکترین پاڵپێوەنراوی موتوربەکراوی کەریش، ماکەری سەردینیایە، کە بەرزاییی ناو شانە نەرمونیانەکەی لە (٦٠سم) پتر نییە. دە ئەمەیان با وا بێ. خۆ وا نییە. کەر لە نێو زمانی درێژی ئێمەدا، ناوونیشان و ناتۆرەی بۆ دانرابێ و بەس، یان زاراوەیەکی ڕۆشن و بریقەداری ئەم (سەربازە ونە)ە مێژوویییەی نێو فەرهەنگە کوردییە پەرپووتەکان بێ و چش، بەڵکو لە زمان و قاموسەکانی، میللەتە کۆن و نوێ و دەر و دراوسێکانیشدا ناوی مووبارەکی زۆر بەگرینکی هاتووە. چۆن نا! گەر تەنیا هەر خۆی ڕۆژێ لە ڕۆژان، لۆنا و سێرڤێوس و سکایلایپ و لاپتۆپ و فرۆکە جاسووسییەکانی زەمانە بوویێت... دەك دەستی تەکنیکی کەرانە وردوخاش بێ، کە لە پایە و ڕۆڵی کەری کەم کردەوە... نەحلەت لە بورغی و مەکینە... هەر بۆ نموونە: ئەم قامووسانە بکەرەوە و یەکسەر بەدوای ڕەسم و دەنگ و پیت و زەڕەزەڕا بگەڕێ. ئەم ناوە ناسك ناسکانەت بەرچاو دەکەوێ:

بەکوردی: خاتوون سمخڕ، مەلای دەنگ گەورە، زەحمەتکێش، چوارپێ، ئایشە گوێپان، ئایشە گوێدرێژ.

بەتورکی: دورت ئەیا غ ، ئیشاك.

بەفارسی: درازگووش، خەر.

ئینگلیزی: ئەس ئەس، دۆنکی.

ڕووسی: ئۆسیۆڵ.

عەرەبی: ابو صابر، ابو زیاد، زمال، الاخضر، حمار، ابو یاس

فرەنسی: ئیێن

ئەڵمانی: ئێزل.

سویدی: ئۆسنا.

بولگاری: مەگارا.

ئارامی: خمارە، خمارتە.

سۆمەری: سی سی.

چ جێی واقوڕمانیش نییە، گەر بڵێم: کەریش زمانی یەکگرتووی تایبەتی خۆی هەیە. وەکو دەڵێن: وشەی قامووسی کەران (٢٠) وشەیە:

بۆ لیخوڕینی: حەچە. ئهە.

بۆ ڕاگرتنی: هۆش ش، شش.

بۆ بانگکردنی: کڕش، کڕو کوڕو.

بۆ ئاوخواردنەوە: داڵ داڵ داڵ.

بۆ زەڕاندنی: زەڕ زەڕ زەڕ زەڕ.

مەقامی کەرانەش: بریتییە لە (٩) پلە و لقە پلە و دەتوانیٚ لە سەر بنچینەی یەکگا و حەوتگا و دە گا و کەر گا، ئاوازی ڕۆژهەڵاتی سەیر سەیر دروست بکا و بهۆنیٚ و بزەڕیٚ، ئەمەیان تەنیا ئەو مەقامبێژانە دەیزانن، کە بەکەرەمەقام ناودارن! لە کاتی زاینیدا، جاشکەکەر یەکجار پاك و خاوێنە و لەم بارەیەوە، لە گشت ئاژەڵەکانی جیهان بەدەر و خاوێنترە. نەك هەر ئەوەندە و بەس، بەڵکو بەفیکەفیکش ڕوو لە ئاو خواردنەوە دەکا. هەر کەریشە بڕوایەکی پتەوی بەبانگەوازەکەی (تەندروستی جیهانی و پاگژی ژینگە) هەیە، بۆیە تا بەباشی لە ئاو ورد نەبێتەوە، ئاوەکەشی زۆر خاوێن نەبێت، نایخواتەوە! لە مەسەلەی ئەمەکداریشەوە هەر لە کەر و ماکەر مەپرسە. گەر بێت و نەختیٚ بەزەییت بەکەرەکەتا بێتەوە و لە ئالیکەجۆ تەخسیری لیٚ نەکەی، ئەوا (نۆکەرێکی) ئەوەندە وەفادارت دەبێت، هەر مەپرسە. هەر جارەی کە لە کاریش گەڕایتەوە، بەشەپۆلە زەڕینێك ڕووبەڕووت دەبێتەوە و جووتکەی (سوپاس و ڕێزلێنان و پێزانین)ت بۆ

دەوەشێنێ، بەڵام نەك وەك ئەو (سوپاس و ڕێزلێنان و پێزانین)انەی كە لە دایەرە كورتاندارەكانی دەوڵەتدا، بەهەزار ناڵ و سمی عەلی پێت دەدرێ، مەگەر ناڵێم گەر ڕاپۆرتی ڕەشت لە نان و جۆركی هەزاران دابێ.

سەمای كەر: جووتەوەشاندنە، وەشاندنێكی هونەری. دوور نییە نا، بەڵكو هەر وایە و ئەمیش چێژێكی زۆر لە ساز و ئاواز و ڕاز و ناز و گاز و ئیقاعات و میقاعاتی ئەم چاخە ئاوازەدارە وەردەگرێت. بۆ نا!، گوایە پێتان سەیرە ئەگەر دیتتان لە سێركدا كەر بەنۆتە، سیفۆنیای سێیەم و نۆیەمی بیتهۆڤن لێ دەدا، یا لەبەردەم گەورەترین و هارترین میكرۆفۆنا زوڕنا دەژەنێ و (خطاب) دەخوێنێتەوە! یا.... یا... یا... هەموو شتێ لە گۆڕاندایە. ئەی نابینی كەری وەحشی چ جۆرە چاوێكی تیژ و بڕندەی پێوەیە و لووتیشی یەجگار كاریگەرە و بڕوایەكی سەیرشی بە(عقدی اجتماعی) هەیە. بۆیە هەمیشە لەگەڵ یەكدان و بەهەموویانەوە وەك یەك، حزبایەتی دەكەن و كار و پیلانی زگپڕكردن و گیرفان دەگێڕن. سەیرش نییە گەر كەرە ناوەحشییەكان ئەم جۆرە كەرانە بە(گەورە)ی خۆیان بزانن و لە هەموو هەڵتیزانێكا، بەدوایان بكەون!

ئەو ئارایشتە (شیرین)انەی كە لە مەغازە و تۆكالۆنی كەردا–موتڵەقی كەر–، هەیە، بڕوا مەكە لە هیچ چەشنە مەغازە و تۆكالۆنێكی سەر بەدایەرەی (ساواك و میت و ئەمن و موخابەرات)ی ئەم زەمانە قەڵپە دەست كەوێ:

كورتان یا جل و یا كۆپان بریتییە لە: (بەن، لباد، هۆڕ، بەڵم، گونیە). هەر ئەو كورتانەش ئەم ئەندامانەی بۆ دروست دەكرێ: (بەرەك، پالۆو، لوڕی، بەرملە، ژێرزگ). هەر بۆ ئەوەیش ئەو كورتانە دانەڕزێت و هەر (بەردەوام) بێت و (كورسیی حوكم) و (ڕاوێژكار) ی (شارەزا)یی لە دەست نەدات، لادێییەكان دێن و (سەرجل)ی بۆ دەكەن كە بریتییە لە تەختە هۆڕێك یا

گلێمێك یان بەڕەیەك كە بەسەر كورتانەكەدا دادەدرێت و بەگوریسێك یان بە(تەنككردن)، جا نازانم ئەم (تەنككردن)ە چەند لەگەڵ (خۆ تەسك و تەنك) كردنی هەندێ لە جلخوار و سۆزانییەكانی ڕێژیم هاوتەریبە! كاتێ كە كەر ڕەشمــە دەكـرێت، دەیـــەهـــا زەنـگـوڵـــە و مـووروو بـــەكـــەمـــەری زرپـــنـیـــا شۆڕ دەكرێتەوە. مەگەر كەمەری باریكی ژنی (حاجی)ی ئەم هەموو خشڵ و زێڕ و زیوەی پیا شۆڕ كرابێتەوە و شەوان نەبێ و بۆگان نەبێ داناكەندرێ! ئایا دەزانن بڵحترین كەر نەزۆكە، چونكە ڕەفزی قانوونی فرۆید و میندیل دەكا و دژی زاوزێیە؟ ئەو جاشەی كە لە نێوان جاشی و بەرباریدایە، بەجاشەتۆڕ نــاوزەد كـراوە. كـەری وا هـەیـە جـووتـە دەوەشێنـێ، هـی وایش هـەیـە لـەقـە دەهاوێ. هەردوو لەم چەشنە كەرە بڕوایان بەتەنافبازی و بەهەڵسوكەوتی هەندێ لە یاساوڵە جەللادەكانی نێو زیندانە سیاسییەكان هەیە. كەری وا هەیە، وەك هەندێ بەناو (شۆڕشگێڕ) كەمەرییە و كە كەوت هەتا بارەكەی لێ نەگیرێتەوە، ڕاست نابێتەوە. زۆربەی زۆری كەر دەمیان سپییە، بۆیە جگە لە زەڕین و جوێن و تانە و تەشەر چی تر نازانن! بەڵام زۆریش لە خەرەنگەز دەسڵەمێنەوە. فێڵ و ناز و نووز و مۆزەمۆزی سێكسی لە نێو كەراندا زۆر باوە: كاتێ كە نێرەكەر خەرمووز دەكا و بۆ یەكەم جار بەدوای ماكەردا ڕادەكا و سواری دەبێ، دەس بەجۆرە ناز و فیزێك دەكا، تا ماكەرەكە هێمن و (هێدی) بێتەوە و بێتە ڕایێ و دەستەمۆ بێت. چش لە كوڕە كاوبۆیانی تڕكەنی بەر دەرگای سینەما و قوتابخانەی كچە نەشمیلە و (مۆبایل) دارەكان، كەچی هەر لێرەدا پرسیارێكی سەرسووڕهێن هەیە كە:

ئایا بۆچی ماكەری بەتەڵەب بۆ نێرەكەرەكەی ڕاناوەستی و ڕا دەكات و دەس بەلەقەوەشاندن و جووتەهەڵدان و هەڵدەتیزێنێ، گوایە: (یەكەم هەنگاو هی كەر بووە و نازی ماكەری هەڵگرتووە) یا ئەمە خەسڵەتێكی سروشتی گشتییە لە جۆری مێیینەدا، بۆ خۆتەسككردن و ئینجە و فینجە. ئەمەیان مەگەر هەر سایكۆلۆجیای كەرێتی وەڵامی بداتەوە و ڕووبەڕووی (یەكیەتیی

ماکەرانی جیهانی) بکاتەوە! کەر هەروەك خاوەنی درێژترین گوێچکەیە، هەروەها دارای زلترین کێریشە. بەلای هەندێ لە مێبازانەوە، هەر ئەو کەرە کە توانیویەتی مافی تەواوی (ق) بدات، نا بەڵکو تۆڵەشی لێ بسەنێتەوە! هەر بۆ زێدە (معلوماتی کەرانە)ش، کەرامێزێك دەڵێ: زۆربەی کێری کەر رەشە و هەندێکیان بازوون. تۆ بڵێی (ق)ی تەسکی ماکەرە شۆخەکان چەرمی لێ کردبێتەوە؟ ئەی ئەو کەرانەی کە کێریان گرێگرێیە و هەر لە دەروونی گرێگرێداری هەندێ رقاوی و کینەدار دەکەن؟ چی بڵێم؟ کێری کەر بەدوو جۆر و نەزم هەڵدەستێ:

١- دایەلان: ئەو کاتەیە کە شۆڕی دەکات و رەپ رای دەگرێ و لە ژێر زگی خۆی دەدا و کلکیشی لەگەڵیدا بەشێوەیەکی ئاسایی بەرز دەبێتەوە، وەك چۆن هیچ مرۆڤێك لەم دنیا حیزەدا ناتوانێ تەکان بدا بەکێری و بەرزی بکاتەوە گەر قنگی نەقووچێ و نەنووقێنێ، ئەوایش کەر، دەوەرە سەرسام مەبە!

٢- ئێرە قبوون: بەو جۆرە هەڵسانەی کێری کەر دەوترێ کە خامباکەی هێندە بەهێزە و پێزە، نێرەکەری باڵندیان بەئاسانی، زۆر بەئاسانی، بەدوو راپۆرتی نووسراو بەکێر و سمی کەر سەد (مودیری عامی کارتۆنی) داخیلی (پایەتەخت) بکات. هەر لەبەر نەبوونی ئەم ئێرەقبوونەشە، کە هەندێ نێرەکەر، با کێریشیان دابێتە لاوە، بەلام ناتوانن خەنجەر بخەنە ناو کێلان و زمان بخەنە هەنگوینەوە، دوای گان کاتێ کە ماکەر لادەکاتەوە و چۆرە میزی دێ، (ق)ی بەنازی پل دەدات و سوورایییەکی سوور، زۆر سوورتر لە رووجی سەر لێوی هەندێ خاتوونی کاربەدەست، لێ دەردەکەوێ. قەپگرتن، لەلای نێرەکەر مانای ماچ ئەبەخشێ، کە گانیش تەواو دەکات، سەری (ك)ی لە رادەبەدەر دەئاوسێ و فڵتەیەکی یەجگار دڵفڕێنی لێ دەبیسترێ و خۆی لە قەرەی ئاوازی ناسکترین کۆنسێرت دەدات! بۆ (علامەی فارقە)ی کەری (رەسەن و

نــاڕەسەن) یش ئــەوا، کــەری (ڕەسەن) خــاڵــێك بــەقــەد پــەنجایــیــەك بەدەستییەوەیە و مووی لێ نایە و دەکەرێتە دیوی ناوەوەی دەستی لە ژوور چۆکییەوە. ئێ دەبزانم ئەم (عەلامەتە) چ کەرە هونەرمەند و کەرەسیاسی و کەرەئەدیبێك هەیەتی... مەگەر زۆر دەگمەن. لام وایە هەر ئەمەیشە، کێشەی ئەبستیمۆکەرایەتی لە نێو ئەنتلجنسیای ئێمەدا بەرپا کردووە. جا گەر ئەم هەموو ئەدگارانەی هەبێ و (ئەنتۆلۆژیای کەرایەتی) نەبێ، کەس نەتوانێ دەرکی پێ بکات. نازانم ئەم هەموو سەرنجانە و ئەو هەموو ئەدگار و تایبەتمەندییانەی کەر، چەند لەگەڵ ئەو پەندە (فولٌقوهوٌر)یانەدا دەپۆڕێ کە دەڵێ و دەزەڕێ:

کەر بچێتە بەغدا، نابێتە حوشتر.

چ حوشتر و حەمام، چ کەر و نەعنا ع.

کەری پیر و قەراسەی تازە: کوجا مەرحەبا.

کەر چوو بۆ زۆزان و گوتی: بۆوەی دوو ستر بو خوم بینم، بەڵێ هەردوو گۆهی خوە لەسەر دانا.

تۆ بەچاوێکی کەریکەتێرییانە و بەوردی و بەتوانج سەیری ئەم پەندانە بکە، ئینجا دەزانی، لەبەر گەلێ شتی (حەزاری و ئەخلاقی و مەبدەئی و ئیقتصادی و میقتصادی)یە کە کەر لە کوردەواریدا، کراوە بەوەحدەیەکی قیاسی. دیارە ئەوانەی وەك کەرن و بەس دەکەن و دەخۆن و دەڕین و بۆ ورگ و ئاخەڵ و باخەڵ پڕکردن دەژین و دەمرن و بەس، دەتۆپن و بەس، هەر هەمان قیاس دەیانگرێتەوە. هەروا ئەو کەسانەی عەقڵیان لەگەڵ هەبوونیان موناسیب نییە، لە هەموو شتێکا: لە لیاقەتا، لە وەزیفەدا، لە نووسینا، لە کڕین و فرۆشتنا، لە خەباگێڕانا، لە بارهەڵگرتنا، لە بەرگەگرتنا، لە وەرگرتن و دانا، لە کەرەندازەیی و چاوچنۆکی و تڕزلی و تەمبەڵی و سینگ دەرپەڕاندنا، لە هەژاری و دەربەدەری و لێقەوماون و

هەڵخەڵەتاندنا، هەر ئەو قیاسە دەیناگرێتە نێو کورتانەکەی خۆیەوە، لە پاڵ ئەم هەموو زەڕینەشدا، کەم کەس ماوە، بەتایبەتی لەم دەور و دوکانە ناهەموارەدا، ئەو ڕاستییە نەزانێ کە: کەر خەتەرێك ببینێ گوێی لۆچی مووچ دەکا، یا گوێچکەکانی لە یەك بدا ئەوا مانای بارانبارین و ڕەحمەتبارین و کاوجۆبارینە. نازانم چ تەرمۆمەتر و ڕادار و دیپلۆماسییەك و ئاژانسێکی کەشوهەوایەکی سروشت و ئابووری و چ تلستارێك، بەقەد کەری (خۆمانە) هۆشمەند و ئازا و گوێڕایەڵ و کارامەیە. هەر ئەم هەموو عەزمەتەشە، تا بێ و وا لە (مشرع)ی (قانونی عوقووبات) بکات و لە ماددەی (٤٨٦) دا بڵێ:

(سێ مانگ حەپس یا غەرامەی سی دینار دەخرێتە سەر ئەو کەسەی، بەبێ بەزەیی لە ئاژەڵێکی وەك کەر بدات، یا مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکات، یا بۆ کارێکی ناڕەوا بەکاری بێنێ و لە ئەنجامیشدا ببێتە مایەی تۆپینی، یا بێت کەرێکی نەخۆش و کەفتە و سەقەت، بەزۆری زۆرەکاری بار بکات و بۆ ڕێی قاچاخچیاتی و قۆڵبڕین و خۆێنمژینی فەقیر و بێدەرەتانان بیانخاتە ڕێگەی پڕ لە ئەلغامەکانی مەترسی یەوە.) جا گەر بەشە کەرانەکەی مرۆڤایەتی لەبەردەم دەقی ئەو ماددە قانوونییە ڕاگرین و حیسابی (١٠) هەزار ساڵەی لەگەڵدا بکەین و (١٠) هەزار ساڵەکەش بکەینە ڕۆژ و تاوانەکانیش دابەش بکەین و ئینجا لە (٣٠) دیناری بدەین، ئەوا ئەو لایەنە بێ ئەخلاقە دەبێ (٦٥٠ / ٣٠) ملیۆن دینار بکا بەتەعویزی مەملەکەتی کەر و بۆ خەزینەی کەرایەتی بگەڕێتەوە. خۆ گەر نەتوانێ پارەکە بدات، ئەوا دەبێ (٩٠٠ / ١٠) ملیۆن مانگ حەپس بکرێت و بەشەرتێ دەرگاوان و زیندانەوانەکەی نێرەکەرێکی فاشستی و ماکەرێکی قوزدڕاوی شام یا موسڵاوی جەللادەکەش کوڕە قەحپەیەکی تارانی یا ئەنکەرەیی یا بەغدایی بێت! هەر لەبەر ئەم گرنگییەی ئەم دەعبا (زامدار) و (پەشێوە)، زۆر جار بووە بەنازناو بۆ زۆر کەرەپیاوی مێژووی کەرایەتی: وەکو دوا خەلیفەی (بنی

امیە)، چونکە زۆر بەرگەی کارەساتی گرتووە و دایکشی کورد بووە، بە (مروان الحمار) ناوزەد کراوە،

لە نێو کۆنە عەرەبە پاپەتییەکانیشا، بەسەرکۆمار و دەرەبەگ و شێخەکانیان دەوت: (حمار القوم) نەخاسمە ئەو ڕۆژانەی کە کەر زۆر ئیعتباراتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی هەبووە و کەسیش بیری لە قانوونی ئیسلاحی زەراعی و مەراعی نەکردووەتەوە و نەیانویستووە دڵی ئاغاکانیان بشکێنن، خۆ تا ئێستاش لە دێهاتە قوڕینەکانی خۆماندا، فەرقی ژن و کەر ناکرێت، کابرایەك لە کەرە غەزریوەکەی بخوڕێ، دەڵێ: (حەچە حەچە ژنی خۆم) یا گەر یەکێ بیەوێ ژن (بێنێ) لەگەڵ کەسی کچەدا، شیربایی و مارەیی بەکەر دەقرسێنن، لە بادینانی خۆمانیشدا، بە کەر دەڵێن: (چارسم بەگ)، یان وا نییە بەگ و بەگزادەیی. هەر بۆ بۆرە مرۆڤەکان بێت و بەس، یا لە پرێکا کەرئەژدادێك، دەوڵەمەند بووبێ و بێو بەگونی شاخ هەڵکەنێ، پێی دەڵێن: (کەرەم بەگ)... دەك لە کەرەمی بەم، یا کابرایەکی بەسەروەت و سامان و چاوچنۆك و نامەرد و پاشەڵپیس بێت، لە شارەزووردا پێی دەڵێن: (دوو کەری خاسی هەس، تەوری هەس، تەورداسی هەس) لە هەندێ شوێنی کوردستانیشدا ئەوەی باڵق بووبێ و ماکەرێکی نە(..)بێ بە (حیز)ی دەزانن. بێگومان هەر کورد دەزانێ مانای (ماف و مافناسی و مافپەروەری) چۆنە و چۆن پاداشتی دەداتەوە. گەر هات و یەکێك زۆر ملهوڕ و مشەخۆڕ بێت و لە دوای خەباتێکی درێژخایەن ببەزێت و بچێتە پاڵ نەیارانی کورد، پێی دەڵێن: (مازی کەرێ، کون لە پاشۆڵێ)... خۆ حزبێك یا دەستەبەندە و گرووپێکیش نەوێرن و نەتوانن، بەردێ لەسەر بەردێ دابنێن و کەچی هەر بەقسە دنیا بکەن بەشامی شەریف و بەدێوجامەی ساختە، خەڵك و خوا فریو بدەن، بەتەوسەوە کوردە حەیاتەکە، پێیان دەڵێ: (بەسەروەرێ، بەپەرەوەرێ، پێیان نەکرا تەنگەکەرێ!) هەر لەبەر گرنگیی کەری مامۆستا و ڕابەر، دەڵێن گۆێچکەی تراجانی ئیمپراتۆر،

زۆر درێژ بووە، بۆیە زۆر حورمەتی کەری گرتووە و بە(وەزیرێکی بێ وەزارەتی) هەرێمەکەی نەگۆڕیوەتەوە، کە کۆمپانیای نەوتی عێراقیش هاتە دامەزراندن و کوردی پێ هاتە تۆقاندن، ئینگلیزە مۆنۆکەرەکان، کەری لەباریان لەبیر نەکرد و بەهەڵەداوان کەری متوربەکراویان دەقۆزتەوە و ڕۆژێ بە دوو دنیاریان تەعیین دەکردن و داوای هیچ جۆرە (شەهادەی باڵا) و (وەسایق) و (حسن السلوك)یان لێ نەدەکردن. کەرێ بەدڵی ئەوان ئیشی بکردایە بەئیجازەی (اعتیادی و مرضی) چاویان قەپات دەکرد و لە ئەنجامیشا چەندین (نوطی شجاعە) یان لە مل شۆڕ دەکردەوە. ئەی بۆ نا، نابینی تا ئەم دواییەش، کەری پرۆفیسۆر دروشمی یاخیبوونی دژی (دادگا) شکڵی و نارەواکان بەرز کردووەتەوە و ئەوەتانێ: سێ کەری سەرکەش لە بینایەی مەحکەمەی کینیا و بۆ ماوەی هەژدە مانگ لەو بینایەدا مانیان گرتووە و دژی بڕیارە ناپەسندەکانی ئەو مەحکەمەیە لە زەرەزەرِدان و هیچ هێزێکی پۆلیس و ئەمن و ئاسا یشیش تا ئێستا نەیتوانیوە لەو هەنگاوە مێژووییە سارديان بکاتەوە.

با بێینەوە لای خۆمان و نێو زمانە پڕ لە (کەر و بکەر)ەکەی خۆمان و بزانین چی دەڵێ، ئەوەی بەوردی لەم زمانەی ئێمە ورد بێتەوە، هەر بەتەواوی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە کورد فراوانترین مەساحەی بۆ کەر داناوە. تا تۆزی تیا بکا، کورد بەقسەی ڕەقی کەللەڕەقان دەڵێ: (کەرتڕ) بەداگیرکردنی موڵك و ماڵ دەڵێ: (کەرەپوول). بە جاڕچی و زوڕناژەنی دوژمنان (کەرەلیاس)، بەمەردمی خۆهەڵکێش و هیچ نەزان (کەرەکونتێ) و بەدرۆ و خۆکردن بەشت و بەنەوەی پێغەمبەران و کاربەدەستان (کەرەشین) و بەپیاو و ژنی زۆرزان و خۆگێلکەر (کەرسەگ).

گیاندارێك هەیە حەز لە ڕۆژ دەکا و بڕوای بەئاینی زەردەشتی هەیە بە(کەرپەسە) ناوی دەبا. باڵندەیەك هەیە سەری لە سەری جاشوولکە و

مامۆستا داروین دەکا (تەیرەکەرانە)ی پێ دەوترێ. ناوی جوانترین گژوگیایەکی بەهارانیش (کەرتەشی)یە، جۆرە دڕکێك هەیە و کەر دڵداریی لەگەڵدا دەکا بە(کەربەش) ناوی بردووە. جۆرە مێشێکی مێمڵ و چەلومل هەیە، ناوی (کەرڕەنگ و مێشەکەرانە)ی بۆ داناوە، ئەستوورترین ڕەگی لەشی لەندەهۆری کەر (کەرسمە)یە، کە دەکەوێتە نێو لووتە قنجەکەیەوە. پیاوی ماندووی ڕێگەی هونەر و نووسین و خەبات بە(کەری لاباران)ی ناوزەد کردووە. گیایەك هەیە و بەبێ کەر هەڵناکات، ناوی لە خۆی ناوە (کەرکۆڵ). جاڵجاڵۆکەش بەتەونەکەی خۆی دەڵێ: (کەرو). کەرێك لە پێش کاروانا بێت، هەر کاروانێ، ناوی (پێشەنگ)ی بۆ دانراوە، کە کەوتە دواوەش و بوو بەپاشکۆیەکی ملکەچ (مینەك)ی پێ دەڵێ. هەندێ کەر شیرە فڕێ دەدات. واتە: لە شیرە پاك دەبێتەوە و ئینجا بەرازە هەڵدەدات، بەواتایەکی تر: قۆناغی (لایەنگیر)ی و (دۆست) و (ئەندام) بەدوو قۆناغ دەبڕێت و چاو لە (پێڕەو و پڕۆگرام) دەپۆشێ یا بۆی دادەپۆشن. هەندێ کەریش هەیە، هێشتا شیرە لە دەمیا ماوە، بەرازەکانی سەرهەڵدەدەن، ئەمجۆرەیان هەرچەند کەمترن و تەنیا لە زانکۆکاندا دەبینرێن، بەڵام قۆناغی (ماجکتۆرا – ماجستێر و دوکتۆرا) پێکەوە کۆ دەکەنەوە! جۆرەکانی لەنجەولار و بەڕێوەڕۆیشتنی کەر، پێنج جۆرە، یا پێنج قۆناغی مێژوویی: (ڕۆیشتن، ڕەوت، قونکە، نەرمەغار، چوارناڵ)، ناڵێم مەگەر هەر یەکێکی وەك (کەرباچۆڤ) لەمە حاڵی بێت و بەس.

کوردی دنیادیدە و کەرپەروەر:

بە (جۆ) دەڵێ: جەو، یەو، یەوی، یەڤە، جەهـ، جهە.

بە (زەڕین) دەڵێ: زەڕەزەڕ، زەڕەکەر، زەڕوزوڕ.

بە (کورتان) دەڵێ: کۆپان، سەکار، سبرێی.

بە (تەویلە) دەڵێ: پاگە، هەرخان، تاولە، شیتیر، گەروڕ کوتان. گەلەخان،

ئاخۆڕ، پانگەهـ، خولە.

بە (جاشکەکەر) دەڵی: جاش، جاشك، داش، جاشهەر. دەشك، کوڕین.

بە (کەری نامالّی) دەڵیّ: کەرەکێوی، کەرکۆلان.

بە (پەروەردی کەری کەر) دەڵی: کەرەوان، کەرلەوەڕێن.

بە (هەوسار) دەڵیّ: قەراسە. قەوچە، لڤان، ڕستە.

هەرشتکیش سیفەتی کەرانەی هەبیّ و ڕەسەنیش بیّ و (خانەدان) ئەوا کورد یەك دنیا وشە و زاراوەی شیرین شیرینی کردووە بەزەنگۆڵە و خستوویەتییە ملیەوە، وەکو: (گێل، گەوج، گەلحۆ، گەلۆر، قەهفکەر، مێشکپووت، حۆڵ، هەری، نەزان، کەرەکەرە، بالە، ئەشکەفتە، بودل، تولاز، خرپۆ، ڕیژگاڵ، ڕەوتەلە، کەرکوتێن، کەرکەدان، کەرۆکە، زلحۆرت، زلحۆ، هێڕ، وڕ، پاتاڵ، حەپۆلمێش، ترقەمچەڵ پێچ، ترپێچ قەمچەڵ، قەمچەڵ ترپێچ، قەمچەڵ پێچتر، پێچ ترقەمچەڵ، قەمچاغ، گەڵ و قەمچاغ، پاڵدم پیس، قنگ لێکەوتوو، گێژووێژ، بەدفەڕ، نانودۆبر، ڕیپاڵ، کەرتر، تاد... تا... تاد! کەرێك جاشێکی ببیّ و جاشەکەش بزیّ و جاشێکی کە بێنیّ، یەکەمیان بە(کەر)، دووەمیان بە(کەرکوڕی) و سێیەمەیان بە(نۆپلان) ناو دەهێنیّ، ئەو قۆناغە دیراسییە نزم و بالآیانەش کە گوێدرێژی زاناکانی پیّ تیّ دەپەڕیّ، ئاوا و بەم چەشنە دەکەوێتەوە:

بەساوایەتی: قۆناغی کوڕولەیی.

بەسەرەتایی: قۆناغی جاشکۆڵەیی.

بەناوەندی: قۆناغی جاشی.

بەئامادەیی: قۆناغی بەرباری.

بەکۆلێجی: قۆناغی شیرەداری.

بەماجستێری: قۆناغی ناویژەهەڵداو.

بەدوکتۆرایی: قۆناغی بەرازەهەڵداو.

بەپرۆفیسۆری: قۆناغی کەفتەکاری.

بەمامۆستای کورسی: قۆناغی بەرەڵلایی.

بە(......) قۆناغی هیچ.

جا گەر هات و بەچاوی گەورۆنەی کەر، سەیری ئەم هەموو وشە و دەستەواژە و ڕستە و ناڕستە و زاراوە و نازاراوە و قۆناغ و مۆناغانە بکەین و بەعەقڵیەتێکی دۆگماتیزمی کەرانە لێیان بکۆڵینەوە. دەبینین:

کە ئەمە خۆی لە خۆیدا (تدرج)ێکی زۆر بەجێی کەریالیزم و کەرایەتییە، کە کەم زمان هەیە لەم دنیایە بێزمانەدا، وای بۆ هەڵبەستبێ، گوایە بۆ نا! گەر هات و زانیمان کە کەر هەر لە زەمانی لوولوو و کاسی و کالدی و سوباری و میتانی و میدییەکانی باووباپیر و داووداپیرانمان، پشت بەپشت لە کورد بارکراوە و هاتووەتە خوارەوە، ئەوەندەی کەر وەفا و ئەمەکی بۆ کورد نواندووە، خەمکی خەمانی بووە و هاوبەشیی خۆشی و ترشیی کردووە. باوەڕ ناکەم (کەس) و هیچ (گەل) و هیچ (بزووتنەوەیەکی) ئینسانی و شۆڕشگێڕیی سەرتاسەری جیهان، تا بە(هیئة الامم المتحدة)شەوە دەگات، بەقەد ئەم ئەوەندە بەدەنگ هاوار و ئاهو نزوولەی کوردەوە هاتبێ. هەر بۆیەش، کورد بەشانازییەوە دبێژێ: (کەری خۆمە و گوێی ناڵ دەکەم) یا بۆ زانینی دوا دەنگوباسی سیاسیی نێودەوڵەتان دەڵێ: (هەباسە، لە دیوەخانان چ باسە؟ سەرگرتن و قەڕاسە) یا بۆ جوانخوازی دەڵێ: (لە کەرێ جل و جۆڕ، لە ژنێ سەر و پۆڕ)... نەك ئەمە و بەس، بگرە لەسەر لاپەڕە هەرە شرەکانی فلۆقۆڕماندا، زۆرجار ناوی بەستایش و نوازشەوە هاتووە و لە سەنگ و سم و تەرازووش دراوە و گەلێ جاریش کردوویانە بەناوی شیاو بۆ شوێن و گوند و مەڵبەند: (کەرترێن، کەردز، کەرەکان، کەرزۆڕ، کەرەکین، کەرمردی...).

یا وەك (ئەگەر زەردەقۆڕە بتگەزێ، تا کەر لە بەغدا و لەئیزگە و

تەلەفزیۆنی بەغدا نەزەرێ، بەرت نادا) یا (کەر بەختە و کورتان تەختە). کە پیرە گەمبۆڵێ زۆر بەهەوەس بێ، ئەوا (کەیفەکەرانە)ی هەیە. کە بەکەریشیان گوت: لە ماڵی خاوەنەکەت شاییە چۆپییە و دەهۆڵە و زورنایە، ددانە مرواریییەکانی خۆی دا بەیەکدا و گوتی: بەمن چی شایی بێ یا شیوەن، خۆ لاقی من لە خەنە ناگرن و خەنەبەندانم بۆ ناکەن، بەشی من، یا دارکێشانە، یا بارکێشان. گەر هات و کچێکی بێ وەفا شوو بەکوڕێکی دڵساف و هەڵخەڵەتاو نەکا، کوڕەکە بەسادەییی خۆی، پێی دەڵێ: هەموو گیانم جووتەیە، کە پرسیارێکیش زۆر قورس بێ، نەخوازەڵڵا لە بواری سیاسەتوانیدا، کوردە قوڕبەسەرەکە دەڵی: ئینسان لۆ وراماخۆ، بەبن کلکی کەرێوە رادەمیسێ. کە بەهێستریشیان گوت: باوکت کێیە؟ لە وەڵامدا بەزەردە پێکەنینێکەوە گوتی: ڕەسەنیی دایکمم پێیە، من لە یەکێکی کەرامێزم بیست، دەیوت: ئەم پەندە بۆ زۆڵەکورد و مۆڵەکورد بەکاردێ. ئەی نابینی کورد بەو زۆلانە دەڵێ: هەموو جاشی ماکەرێکن.! ئەوەتانێ کەرە پزیشکێك لە بارەی مەتەڵەکانی ژیان و گوێچکەی کەرەوە دەزەرمێ: (نەشتەری پزیشکی کەوتە گەڕ و لە پشت گوێچکەی مرۆڤدا کەوتە کار و چەندین ماسوولکەی لە کەڵکەوتووی دۆزییەوە، کە بەر لە ملیۆنا ساڵ گوێچەکەی باپیرەکەرەکانی ئێمەی دەجووڵاند، کەچی کە گوێچکەی ئێمە لە چەند بۆقیەکی بەراییەوە گۆڕا بۆ ئەم شکڵە ئاڵۆزەی ئێستای، پێویستی بەو جووڵەیە نەما تا بۆ هەموو لایەکی بابدا. دیارترین نموونە و بەڵگەی کەرەمرۆڤ و مرۆڤەکەر، هەر ئەو گوێچکەیەیە. سەرباری ئەمە و سەرباری ئەوەش و ئەم هەموو ئەرك و جەفایەش کە کەری ئازا بۆ کوردی کێشاوە، جارناجار نەقیزەی زۆر کوشندەی تێ دەسرەوێنێ:

کەری دێزە حەز لە تۆپینی خۆی دەکا، تا زیان لە خاوەنەکەی بکەوێ.

بەکەریان وت ماریفەت بنوێنە، ئەمیش کلکی بەرزکردەوە و ترێکی لێ دا

کەر باری کەی لە تفەنگ، گورگ هەر دەیخوات.

کەر ئاخری شەڕ بێ، کورتانی دەوێ.

یا لە جۆرکە شیعرێکی هەتیو و بێ خەم و کەسدا کە دەزەرمێ:

**کەرێ بکێشێ، بــاری تـــەماتە**
**بۆ لەپی نەکا، قۆندەرەی باتە**

یا ئەگەر شتێ سیزیفانە و بێ ئەنجام بێ، دەڵێ: (کورتانی کەری دەجاڵ.) دەشڵێن جارێ لە شوانێکی شەکەتیان پرسی: ئەرێ تۆ دەسکەوتت لە داری دنیادا چییە؟ ئەمیش بەشێنەیی وتی: کەرگاین! ئەی گوایە شت لەم پەندە بەقەشاویشتر هەیە کە دەزەرمێ: (بەری دنیایان نەخواردبێ، بەڵام خۆ «کەرە»کەی ماستیان خواردووە...) نۆشیان بێ. (ڕەوەند)ی شاعیریش، ڕوو لە بەختی خۆی و ڕۆژگار دەکا و دەزەرێ:

**دولت بەخزان و حشمت بەسگان**
**پس ما بە تماشای جهان دادەئین**

کەچی پەندێکی حوشترەوانێك هەیە، بەپێچەوانەی ئەمەیە: (الانسان سواسیە کاسنان الحمار) مامۆستا (دیکارت)یش زەرموویەتی: (مادامەکی دەزەرم کەواتە من هەم.) مامە مارکس واتەنیش: (کەر بەهادارترین سەرمایەی جیهانە.) لە بیرشت نەچێ، ستیڤن دیدالۆسی قارەمانی ڕۆمانەکەی مستەر جۆیس (پۆرترێتی کەرێکی لاو) کەرە، کە لە ئەنجامدا دەس دەکاتە قورسەقول مژین و زەڕاندن و لووشکەوەشاندنێکی دایلەکتیکییانەی عەباسییانە!

هەمدیس لە کوردەواری و لە کەرستانەکەیدا، ئەم ئافەریدە سەیرە زۆر چەشنی هەیە، وەکو چەشنی لەبەرکردن و داکەندن و هەڵسوکەوت و ئۆتۆمۆبیل و کۆشك و تەلار و کۆمپانیا و ڕەسیدی بانق و سەندووقە

وێسکی و قەحپەی کشمیری و ئیسپانی، هەندێ لەوانەی کە زۆر باش ناسراون، هەر بۆ نموونە و بەس و چی تر: (کەری دێزە، کەری باڵەبان، کەرەبۆز، ماکەری ئابلاخ، کەری شەودێز، کەرەهێستر، کەری کۆڵکن، کەری سێگردکان، کەرەگولە، کەری مالوان، کەرەبۆر، کەرەشین، کەری لەیلان، کەری قەسابخانە، کەری قوبرسی، کەری حەساوی، کەری قاترین، کەری شامی، کەری سپیی بەغدایی، کەری قەرەج، کەری هەڵشۆ و تا...تا...تا! جۆرە کەرێکیش هەیە، بەنێر و مەهای نەزۆکە و بە(کەری یەختە) ناودارە. چەشنێکی کەشی هەیە دەیخەسێنن و بەکەری (خەساو) ناوی دەبەن. کەرێك کە لە بنار و ڕێچکەی شاخ و دەوەنەکان خۆشبەز بێ (کەری ڕەهوان) ناویەتی.

دەك بۆ ئەو زەمانە ڕووڕەشەش کە لە مەیدانی (جامبازان)دا (کەرگەل)مان دەدی، هەندێکیان لە ژێر باری دار و ڕەژووی سەرپشتیان، بەم خەڵکە ڕەشۆکە پێ دەکەنین و هەندێکی تریش سەودا و مامەڵەی لەسەر دەکرا و دەدرایە بەر نەقیزەی کرپارە کەرباوکەکەی. ئەی کێ ئەو یارییە خۆشەی جارانی لە بیر ماوە (هەی کەر هەی کەر هەی لە پیاوی کەر) یا (کەری کەر هاژۆ)ی دوای بانگی مەلای شێوان لە کۆڵانەکاندا سازدەدرا. بەپێی قانوونی (عرض و طلب)یش نێرەکەر نییە نەزەرێنێ، مەگەر ناڵێم (ژەهر) خواردوو کرابێت. ماکەری وایش هەیە کە کورڕۆڵەکەی لێ ون دەبێ، لەتاوا گوانی پڕ دەبێ لە شیر و دەزەرێنێ. لە کاتی برسیەتی و تینوویەتیشدا لووشکەلووشکان دەکات. ئەو کەرانەیش لە کاتی زەرپندا بترن، بەکەری (خاوەن ئیمتیاز) ناو دەردەکەن!. ئەو کەرەی پەیزەن نەبێت. ئەوا لە قۆناغی کورڕۆڵەییدا، هەردوو قاچی لە پشتی کەشکە زەنگۆڵییەوە بەدوو پارچەپەڕۆی نەرم دەبەست و (پەیبەس) دەبوو. دەك مام باقلۆڤ گۆڕهەڵتەکێنە! هەروەك چۆنیش مایین دێتە تەڵەو، مانگا دێتە کەڵ و سەگ دێتە دەستان و با... کەریش دێتە فاڵ... فاڵ... فاڵ... فاڵ!

من تا ئێستا ئەو نهێنییەم بۆ ساغ نەبووەتەوە، کە بۆ بادینان و خۆشناوەتی (کەری ماکەر) ڕاناگرن؟ یا بۆچی قەرەج و دۆم و خێڵەساتی دەوروبەری شارەزوور بەزۆری (ماکەر) ڕادەگرن؟ من بەدووری نازانم کە ئەمە ڕەمزێکی قۆناغی (مشاعە) بووبێ و هێشتا لە کوردستانی چاخی تەکنۆلۆجیا و سەدەی سفردا لە باودابێ. بۆ گوایە ئێمە چیمان لە خەڵکی پاشکۆکەوتە زێترە، مەگەر پاشکۆ نەبێ! نازانم ڕای کەڵەپیاوان و بەتایبەتی قەیرەژنانی (یەکێتیی ئافرەتانی جیهان) و ماکەرانی یانە ڕووتەکان، سەبارەت بەتیۆرییە ناهەموارەکانی بادینان و خۆشناوەتی چییە و چۆنە؟ نەخوازەڵڵا گەر هات و زانیمان کە کەریش، بەنێر و مێیەوە، خاوەن: (انفتاحاتي هائل و عواطفي رقيق و مشاعري عميق و استجاباتي سريع و مفاجئاتي غريب و اندهاشاتي عجيب و معاناتي کەرنشالیزمێکی یەجگار فراوانە.) ئای چەندێ خۆشە کە مرۆڤ، بەجاشکی بێت بەکەری دەرچێت:

**بيچاره آن کسى که گرفتار عقل شــد**

**خوشبخت ان که کرخر آمد والاغ رفت**

بێگومان وەکو چۆن زانایەکی سەگامێزی وەك پاڤلۆڤ توانیی سەگ وەك مرۆڤ دەساژۆ بکا، دەئاواش ئەو تیۆرییە توانیویەتی وا لە کەر بکا، لە ڕێی تەئسیراتی فسیۆلۆجی و میکانیکی و (مسحوق الديمقراطية)وە، تا بێت لە دین دەربچێ و عەقائد دوای عەقائد بگۆڕێتەوە و ئەوەی دوێنێ باوەڕی پێی هەبوو، ئەمڕۆ ددانی لێ گڕ بکا و بیداتە بەر جووتکەی ئیدیۆلۆجی. هەر ئەمەش وای لە هەندێ کەرپەروەران کردووە بێن و بڵێن:

**کەرەبۆز خۆش بێ لە غاران**

**جۆی بــۆ دەکــرم بە باران**

بۆ نا ئەی گوایە ئەو پەندەکەرانە کوردییە ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە کە دەبێژێ: (کەرۆ نەمرۆ حەتا قیڤار شین دبی) یا (کەرە مەمرە بەهارە

کورتانت دی لە شارە، گیات بۆ دێ بەبارە.) ئەی نەتانبیستووە، هەتا ئێستا فێرکەری تیپە سێرکە جیهانییەکان بەم دواییەش هەشت (جاشەکەر)ی گوێ قیتی هێناوەتە ناو پرۆگرامەکانی خۆیەوە، بەمەش هەموو زاناکانی دەروونناسی و پزیشکایەتی و ئانترۆپۆلۆجیای سەرمەست کردووە و دۆش داماون. دەی گوایە ناوی (کەری ئیمپراتۆرتان نەبیستووە، کاتێ کە قەراڵی بیزەنتە، بڕیاری دابوو دوو سێ دەرزەن لە کەری باش بەخێو بکەن و بەوناوەش ناوی ببەن، تا چەل و ناچەلێ، خاتوونەکەی سوود لە شیرەکەی وەرگرێت و لەشی ئاوریشمینی خۆی پێ بشواتەوە و شتی تریشی پێ بکات. لە فیرعەونستان و ڕۆمانستانیشدا، دیارترین هۆی پۆستە و پۆستەکاری تەنیا هەر کەر بووە و سوودێکی زۆریشی بۆ خەزێنەی دزراوی دەوڵەت هەبوو. دەڵێن لە وەختی سەفەربەردا، کاتێ کە هێزەکانی ئینگلیز بەسەرکردایەتیی ژەنراڵ تاوزەند لە شاری کووت ئابڵووقە دران، لەبەر برسێتیی. ئەو ژەنراڵە کەرپەرستە. فرمانێکی دەرکرد تا (کێری کەر) بەنرخێکی زۆر بکڕن و بەوپەڕی ڕێزەوە ڕیزی بۆ بگرن و بیخۆن. مەگەر هەر ئەو ئینگلیزە کەرامێزانەی نەوەی (سایکس – بیکۆ) دەزانن کە کەر و دەعباکەی، چ قەدر و قیمەتێکی هەیە، لە ڕۆژانی تەنگانەدا. دەڵێن: جارێکیان سێ ئایدیۆلۆجیستی بۆڕدراو، ویستیان کەرێك بخەنە سەر زەڕین، بەڵام کەرەی گۆڕین ملی بۆ نەدان و ئێستا و ئەوساش نە زەڕی و نە ئەوانیش توانییان بیخەنە سەر زەڕین و پێشی وتن: "ئەوەی ململانێ لەگەڵ کەرەکەی بکا، خۆی تێ دەکەوێ. "ڕاستیش دەکا، چونکە کەر وا دەزانێ چی وای لە ماینەکانی دیکتاتۆر کەمتر نییە، گەر زۆرتریش نەبێ، زۆر شانازیش بەوە دەکات، کە ئەم بەم هەموو دنیا جەنجاڵەی خۆیەوە، گەلەك لە مینی (شارەزا) و (راوێژکەر) وترەزاناکانی هەموو (حقولی معرفە و سیاسەت) بەهادارتر و لەبارترە. نازانم بۆ هەندێ لە ئێمەمانان بەکەر ناوێرێ و بۆ کورتان ڕەپەڕەپییەتی. دەی گوایە ئەمانە چەند نیشانەیەکی ڕەپە و خۆی

ئاوات و ئارەزووی هاری کەر نییە بۆ: جەژن و بەهار و سەیران و خۆشی. بۆیە بەپەخشانێکی چڕوپڕ و خڕەوە، هەر بەو مێردەزمۆڵکە شەپانشاتە شەمشەمەینگە کەرانە دەڵێم: "من نازانم ئەوانەی کۆمیان دادەخورپێ و دەستیان دەلەرزێ و دانیان چۆقەچۆقی پێ دەکەوێ، بۆچی بەرامبەر کەری قارەمان لاخ و لووخ دەچێتە کەوڵیان و شاڵپەشاڵپ وەك مامووڕەقووچە دەشرینگێنن و پانە پانە دۆزاندەرە بەقەڵەمە مرومووچەکانیان دەکەن و چاوە قاچ و قووچەکانیان ئاوەژوو دەبڕنە پاژنەواژەی گوڵگڵۆکەی مێژوو، ئەوانە دیارە و ملیۆن بار دیارە، کە فینگەی شامشەمینگەی حەزەرژدیان دەدرکێننە ناو میعرۆلکە و تیعرۆڵکەوە. ئەمن کە خۆم بەکەرەوانێکی زمان سوور سامکەرە دەزانم، بریا و تریا، ڕێگە نادەم بەو مێردەزموڵکە شڕ و شەپانشاتانە عەزابی ڕۆحی شیعر و ژاژڵە سوژنی کچێنیی شیعر قنج بکەن و هۆپاندەمی ژانەکانی نا ڕچانبیرەکانی بکرێ جێنگەلۆنگی بەرکەوێ. "همم... همم... همم! داستانۆکەیەکیش هەیە دەزەرێ و درێژدادڕێ دەکا و دەڵێ: کاتێ کە خوا ویستی زمان بەسەر مرۆڤە کەڕولاڵەکاندا، دابەش بکا کەرێکی وەك تەتەر ناردە سەر زەوی و جۆرکی پڕ کرد لە وشەی خۆش خۆش و جوان جوان و بەتام، ئەویش کۆ بەکۆ، دۆڵ بەدۆڵ، شاخ بەشاخ، تەرس بەتەرس، قەرسەقوڵ بەقەرسەقوڵ، گەڕا و وشەی بەشییەوە و لەوێشەوە گەلێ زمانی شیرین و جوانی لێ کەوتەوە. کەچی کاتێ گەیشتە کەرستانەکەی ئێمە، ڕاما... ڕاما و زەڕاندی، لەناکاو زریانێکی کوشندە هاتە زەڕین و ڕێی بەو کەرە تەتەرە گرت، ئەویش لەترسا جۆرکەکەی تووڕ دا و بەهەڵتیزانەوە ڕای کردە مالی (کەرە زمانەوانێکی زانا) و خۆی لە تەویلەکەیدا شاردەوە. لە پاشا ئەم هەموو لەهجە و مەهجەیەی لێ کەوتەوە و تا هەندی شارەزا و (بلیمەت) لەم سەدەیەدا بازرگانیی پێوە بکەن و سەری نەتەوە بشێوێنن.

کەری ئازیز، داوای لێبووردن لە ئازیزی مەولەوی و بێسارانی دەکەم،

گەلێ حیکایەت و سەربردەی سەیر و سۆبەتی لەمەڕ کراوە، هەر لە هەورەمانەکەی خۆماندا (هەر) یانی کەر. من بەدووری نازانم ئەم (هەرە گەورە گچکە و هەر هەرانە) لە بنەچەکەدا لە (کەرە گەورە) (کەرەگچکە) و (کەر کەرانە) کەوتبێتەوە. دووریش نییە (نۆکەر)ی ئیمڕۆ، کە مانای کرێگرتە و ئاڵقەلەگوێ و چاوبەرەوژێری دەبەخشێ، لە بنجدا (نوێ کەرە) بووبێت. واتە: ئەو کەسەی شت نوێ دەکاتەوە... نوێباز، نوێساز، یا نوێخواز. لە هەموو شتێ: لە قەمارە، لە شیعر و چیرۆك و شانۆ و ژنگۆڕینەوە و دۆنجوانی و وەزیفە و کورسی و شۆڕشگێڕی و ملشکاندن، بەهەر شێوە و هەر نرخێ بێت، ئا ئەمانە بە(یازدە پشت دەگەنە سەر کەرەشین) و هیچی تر و فرچکیان بەشیری کەر گیراوە و هیچی تر.

تۆ هەر گوێ لەم هەڵسەنگاندنە بەنرخەی قورئانی قەدیم بگرە کە دەڵێ:

"ان انکر الاصوات لصوت الحمیر." بەتایبەتی کە بەگۆڕانیبێژێکی چەقەچناوە و چەقچەقەی بنگونان دەوترێ. یا ئاوڕێ لەو کارەساتە بدەرەوە، کاتێ کە میسرییەکان بەدەستەبەرەکەی ئیمامی عەلی – محمدی ابوبکر–کردیان، کە لە کاتی خنکاندنیدا خستیانە ناو کەوڵی کەرەوە و ئینجا دەستیان خستە بینەقاقای، سەیریش نییە ئەحمەدی خانی لە نەوبەهارە پڕ لە قەرسیلەکەیدا بڵێ:

**(اکیس) مرۆڤێ تیژ فهم (اصمع) مرۆڤێ گۆه بچیك**
**(اکثم) مرۆڤێ گۆه بڕی (اصمغ) وەکی (ابهم) کەرە**

یا کەرە شاعیرێکی تر خۆزگە بەکەر بخوازێ و بزەڕمێ:

**ان الحمیر لأولی بأن تعز وتکرم**
**فلیتنی کنت منها کیما أفوز وأغنم**
**ولیتنی کنت أحجو ولیتنی لست أعلم**
**ولیت عقلی یفنی ولیت حسی یعدم**

وليت انى أصم وليتنى كنت أبكم
عساى أحيا سعيدا مثل الحمار بن حنتم
فلا أحس وأشكو ولا أغار فأظلم
ولا أذاذ فأقصى عن النعيم وأحرم

کەرە عەجەمێکیش دەڵێ:

با اين دوسه نادان كه چنين ميدانند
ازجهل كه داناى جهان ايشانند
خرباش كه اين جماعت از فرط خرى
هركو نه خرست كافرش، ميخوانند

کەرەعەرەبێکیش وتوویەتی:

قال حمار الطبيب يوما
لو أنصفونى لكنت أركب
لإننى جاهل بسيط
وصاحبى جاهل مركب

شێخی گەورەشمان، (هەزار کەر بەقوربانی بێ) لەبیری نەکردووە، تابێ و کەریکاتێرێك بخوڵقێنێ و باسی یەکێ لەو دەسبڕانە بکات، کە یاری بەخوێنی ناحەقی میللەت دەکا و بڵێ:

جاشکترین میکایل وەعدی بەجێ نەهێنا
عومری گەیشت بەهەشتا وازی لە کەر نەهێنا
عەمبازی بوو تڕاندی، گوتی ئێستا بەهارە
تەئریخی دەرنەهێنا، تا ڕیخی دەرنەهێنا.

ئیستکشافاتی هەرە تازەی ئەم دنیا پڕ لە کەڕەنایەش، بەم دواییە دوورگەیەکی لە ئۆقیانووسی ئەتلەسی دۆزیوەتەوە، کە ژمارەی دانیشتووانی (دوو ژن و پێنج پیاو و کەرێکە) و کۆمارۆکەیەکیشیان هەیە،

دەك دەستم بشكێ كوردی چل ملیۆن و كەری وەفاداری كوردستان.

لە كتێبەكەی خۆی كە لە ژێر كورتانی (مۆسیقای جاز) دایە، ماریشاڵ ستیرنز كە لە دەنگ و ئیقاعاتی دەنگەكانی كەریش دەزانێ دەڵێ: ئەو لالانەوانەی كە لە موستەعمەراتی ئینگلیزیدا دەوترێ وەك: (نوێژەكەرانە) وایە: زەرینی كەر... یانی لە جیاتی ئەوە بەشۆڕش و گولە و ئاگرەوە ڕووبەڕووی داگیركەر ببنەوە، بە زەڕەزەڕ بەرەنگاری بوون، سەیریش نییە گەر لەم دواییەدا گرنگترین یاسایەك دەرچووبێ. (داوای لێنەبووردن لە مجلیسی یاسادانان دەكەم) و ڕێگەی كەرگاینی دابێ، ئەوجا وەرە مەمرە و بزانە كوردستانەكەی ئێمە لەم بارەیەوە چەند سەدە لەو ولاتە تازەیە پێشكەوتووترە. ئەمە و چەند ساڵێ بەر لەم ساڵە پڕە. لە فڕەنسادا، پۆستەرێك گەورەترین خەلاتی وەرگرت كە بریتی بوو لە (ڕێزە كەرێك كە چاویلكەی سپییان لە چاودایە و بەتەوسەوە، بەو كەسانە پێ دەكەنن كە باوەڕیان بە (میدیا) و (وسائلی اعلام) هەیە.

دەڵێن: خواش ئەو كەسە بگری وای وتووە، گوایە: كە دیلێكیان دەگرت، هەر چوار دیلێك بە(ڕۆپیە) یەك دەهاتە فرۆشتن، هەر بەم بۆنەیەوە و لەو زەمانەشدا نرخی تاقە كەرێك پێنج ڕوپیە بوو. واتە: هەر كەرێ پێنج دیلی دەهێنا. بەم دواییەش ئەم فیلمە لە جەنگی نێوان عێراق و ئێراندا زۆر بەزەقی ڕەنگی دایەوە... ئاخ. ئەوەی بەم دواییەش لە كشووفاتی عیلمی موقناتیزی دۆزراوەتەوە ئەوەیە كە: (تناسخ الارواح – دۆناودۆن) لە ناسینی كەردا یەكە و مەجالی مەقناتیزیی كەران یەك مەجالە و لە یەك دەكەن و ناچنە نێو دۆنی هیچ ئافەریدیەكی ترەوە، بۆیە زووبەزوو یەكتری دەناسنەوە و كورتانی یەكتری هەڵدەمژن و ملۆمۆشی یەكتری دەكەن.
دەڵێن: جارێ بەنێرەكەرێكیان وت، (ق) قەلاچۆكرا و خەریكە دەفەوتێ، نێرەكەرە زیرەكەكە دەستی كردە زەڕین و جووتەوەشاندن و زورمەزلە و شین

و ڕۆڕۆ... که پێیان وتەوە: تەنیا (ق) ماوە و ئەویش بۆ تۆیە، لە کەیفان دەستی کردە جرتەپێکەنینێك و کەوتە هەڵەکەسەما و ئۆخەی ئۆخەی و شوکرانەبژێری. سەیریشت نەیێ، گەر کابرایەکی قۆشمە بێ و بڵێ: (ومن فضائل الطبيعة أن جعل عير الحمار تحت بطنه، فلو جعله علي ظهره فأين تركبون.) کابرایەکی لاسار و سەرسەختی کرمانجیش هەبوو، جارجار دەیگوت: بابم بەخوای بەغدا بەحەشتی نێرەکەرانە، گەر لە پایەتەخت بووی، دەبی زۆر نێر و خورت و بەتەوژم و هەوەسباز بی و لا لە هیچ نەکەی و بەغدا بدەیە بەر کیر... بەتایبەتی گەر لۆ (مفاوەزات) چوویە ئەوێ!! لە کابرایەکی نەگریسیشیان پرسی: ئەرێ دنیا کێ خواردی؟

وتی: زمانلووسان، تەڕلووسان، بێ نامووسان.

ماوەیەکیش دەبێ کیمیاکەرێکی جەرمەنی زەڕاندوویەتی کە گوایە لەشی ئاڵۆز و (معقد)ی کەریش وەکو لەشی هەندێ ئادەمیزادی کەر و کەرباب بریتییە لەم شتانە

١ – ئاسن: کە حەوت مێخزنجیری گەورەی لێ دروست دەکرێ و زیندانییە مەردەکانی پێ مێخزنجیر دەکرێ.

٢ – بەز: کە نۆ کیلۆ مۆمی لە دەعبای کەر نەرمتری لێ دروست دەکرێ و بۆ شەوی بووك و زاوایی زۆر شیاوە.

٣ – خەڵووز: کە پەنجا و پێنج دەرزەنە قەڵەمی ترسنۆکی لێ دروست دەکرێ و بۆ نووسینی وتاری ڕۆژنامەکان یەکاویەکە.

٤ – فۆسفۆر: هەشت سەد و بیست دەنکەشقارتە پێك هاتووە بۆ شەوی درێژی ترس و لەرزی خۆفرۆشییان خراپ نییە.

٥ – خوێ: کە نۆزدە کەوچکە خوێ بۆ سارێژکردن و برژاندنی قوزە دڕاوەکانی تیرۆریست و فاشستی لێ دروست دەکرێ.

٦– شەکر: پەنجا کڵۆشەکری بەتام و کامی لێ دروست دەکرێ و بۆ هەراجخانە و شەکرشکاندنی بازاڕی شەرمەندەی سیاسەت زۆر بەناوبانگە.

٧– ئاو: چل و پێنج لیترە میزی لێ دروست دەکرێ، کە لە میزی هەندێ لە کچە نەوڕەسیدە مەمکڕزیوەکانی زانکۆ و مانکۆ ڕوونتر دەبێت.

هەر ئەو کەرە کیمیایستە وتوویەتی: ئەرکی زانایان لە نێو ئەم هەموو ئاو و شەکر و خوێ و فۆسفۆر و خەڵووز و بەز و ئاسنەدا ئەوەیە کە بزانن کامە لەم شتانە، لە لەش کەم بووەتەوە تاکو چارەیان بۆ بدۆزنەوە، چونکە هەر کەمییەك لەم شتانەی نێو لەشی کەری ڕۆحسووك، دەبێتەوە مایەی تێکچوونی گون و گورچیلە و دیدە و لووت، لە ئەنجامیشدا تێکچوونی قییەم و ئایدیۆلۆجییەت و ژێرخستنی حەقیقەت و داد و مەردایەتی.

هەر لەبەر ئەم هەموو بایەخەیە، کە کەرە شانۆنووسێکی ژانگرتوو و بلیمەتی ئەم چاخە ڕووبەڕووی ئەم چاخە بێتەوە و بەزەرینێکی پڕ لە ژان و هەژانەوە بڵێ: ″یۆلیۆس قەیسەر هەزاران باخچەی جوانی لەم جیهانە بۆ کەرە ماقووڵەکان بنیات نا، منیش، منیش، قەحبەیەکی مەزنم دایە ئەم جیهانە!″

کەریوستۆڤ کۆلومبسیش بەگونەخرەی کەر هەڵخەڵەتاو وای دەزانی ئەم زەوییە بەقەد گونی پایب لە دەم و شەفقە لە سەرەکانی، بازاڕی هاوبەشی ئەوروپایی خرتر نییە. ئەگینا ئەم هەموو ئەرکەی نەدەکێشا و ئەم کەرایەتییەی نەدەکرد؟ گونی خۆت بگرە. با بازاڕەکانی بەرژەوەندی و (مصالح) نەیبا.

بە(حەقیقەت)، کامە حەقیقەت. خووورەوشتی بەرزی کەری بێ گوناهـ لە دەبەنگی و عەقڵسووکیدا، لە هەندێ (اوساطی خۆمانی و نێودەوڵەتی) دەنگی داوەتەوە، کە ئاوەژووی ئەو هەڵوێستە گلاو و ناهەموار و، نا، نا، نا،

ناناکانی ئەمڕۆی ژیانی سیاسییانەی ناوەخۆ و نێودەوڵەتان دەکاتەوە. نەخوازەڵا دوای تەواوبوونی مۆبایل و هێلی تەلەفۆنی سەوز و سوور و شین و ڕەش و زەردی نێوان کۆشکەکانی واشنتەن و مۆسکۆ و پاریس و لەندەن و تۆکیۆ بۆیە کەوا کەر نەفرەتی لێ دەکرێ، چونکیم کاتێ کە شەیتان، شەیتانی (بەرژەوەندی گەلان مەزاتکردن و ماف و شۆڕشگاینی گەلان) بینی پێی ناکرێ بچێتە ناو کەشتییەکەی حەزرەتی نووحی گەلانی ڕاپەڕیو، گورج خۆی کوتایە نێو قوونی کەر و لەوێوەش بۆ ناو ئەو خەتە تەلەفۆنییانە، بێ ئەوەی ئەو گەلانە ئاگایان لە (...) خۆیان هەبێ.

کەر گەلێ ڕەنگی هەیە: ڕێژ، شین، سەوزە، سپی، ڕەش و بۆڕ و...

جا گەر ویستت پاشەڕۆژی پڕ لە ناڵ و بزمار و سندم و زەڕ و مرۆڤایەتی و جیهان بزانیت و شتێ بخەیتە سەر قەرسەقولی مەعلووماتتەوە، ئەوا چەند ڕەنگێك لە چەند کیشوەرێکەوە بێنە: ڕەنگی سوور لە ئاسیا، زەرد لە ئەمریکا، ڕەش لە ئەفریقا، شین و مۆر لە ئەوروپا، بەشێنەیی و زۆر بەوەستایی لە نێو جامۆڵکەیەکی کریستالدا، ڕەنگەکان لەگەڵ قەرسەقول تێکەڵ بکە و بەمیزی کەریالیزم بیگرەوە، لە پاشان بیڕشێنە سەر پارچە قوماشێکی سپیی سادە و بۆ چەند جڕتکێشانێ لێی گەڕێ و چاویشت بنووقێنە... چاوت بکەرەوە و بەوردی سەیری کە و ئینجا پانۆرامای سوریالیزمییانەی کورد و مرۆڤایەتیت بۆ دەردەکەوێ. دەك نەعلەت لە چاخی ملشکاندنۆلۆجیا و درۆ و بەڵێنلۆجیا و چاوڕاولۆجیا و غەملۆجیا بێت و نەبڕێتەوە.

ئەمەیان وا، دەبا بێینە سەر ئەسڵی مەقسەد، ڕێزمانی پڕ لە کاروکەری ئێمەش، هەر لە گاتا و یەسناوە بگرە، تا ئەمڕۆ تەخلیدی کەری کردووە و پایەیەکی زۆر باشیشی پێ داوە، نەخاسمە لە (پاشگر و پێشگر)دا. مەبەستم (ك)ی کەر و (ق)ی ماکەر نییە ببوورن. واتە: گەر ناوێ پاشگری نەرمی (کەر)ی بچێتە سەر، ئەوا دەیکا بەئاوەڵناوێکی (ڕەپ و ڕەق). یا

بەپێچەوانەوە، ئەگەر هات و پێشگری ڕەقی (کەر)ی بەخۆوە بینی، ئەوا دەبێ بەئاوەڵناوێکی سفت و پوختی کۆمپیوتەرانە: (نۆکەر، نوێژکەر، پەپازکەر، شەڕکەر، شاکەر، کەرەماموٚستا، کەرەسیاسی، کەرەنووسەر، کەرەکچ، کەرەهونەرمەن دو کەرەفەیلەسووف، کەرەزمانزان، کەرەخاتوون، کەرەقوتابی، کەرەئەندازیار، کەرەپزیشك، کەرەکرێکار، کەرەجوتیار، کەرەکاسبکار، تاد، تاد، کە، کەر، کەر، کەر، یا هەندێ جار کە ئاوەڵناوەکە پێ لە ناو دروست دەکرێ: (کەرایەتی..........) (ئەم کەوانە خۆت پڕی کە) خۆ کە دنیاش دەکەوێتە پشێوی و قوڕمساغێك و دوان و سێیان پەیدا دەبن و هەموو شتێ بەهەوەسی خۆیان هەڵدەسەنگێنن و میللەتیش دەکەوێتە جووتەوەشاندن و زرمەزلەیەکی بێ سوود، ئەوا (کەربازاڕی)یە و هەر مەپرسە. ناشزانم چەندین (پەی–کەر) بۆ ئەو پیاوە گەورە و کورد فرۆشانەی کە شیرازەی هەموو شتێکی پاکیان پچڕاند و بەوپەڕی (دڵسۆزی) و (مەسئولیەت)ەوە دایکی خەڵکیان (...)، دامەزرێنین. سەیریشت پێ نەبێ گەر شاعیرێکی لاڵ و پاڵ بڵێ:

**حباك الله من دون الحمير**
**واطعمك الكثير من الشعير**
**فداك الأغبياء لأنت ادرى**
**من القاضى بتصر الأمور**

یا:

**زياد لست اعرف من ابوه**
**ولكن الحمار أبو زياد**

یا هەر لەم بارەیەوە، قورئانی قەدیم، زۆر بەوردی کەر دەنرخێنێ و دەفەرمێ: "مثل الذين يحملون التوراة ولم يحملوها، كمثل الحمار يحمل اسفارا..." نازانین ئەوانەی بەدرۆ خۆیان دەخەنە ژێربار و بارەکەشیان پێ

هەڵناگیرێ لەبەردەم ئەم ئایەتە چۆن چۆکیان نشکێ. کەرەگەورەکەی شیرازیش گلەییەکی گەرم لەم بۆرەپیاوانە دەکات و دەڵێ:

**اسب تازی شده مجروح بەزیر پالان**
**تۆقی زرین همەدر گردن خر میبینم**

پێم وایە هەموو کەسێ بەم کەریکاتێرە پێ دەکەنن، با (کەریشیان نەدیبێ، خۆ قەرسەقولیان دیوە.) ئەی وا نییە؟ دەشڵێن، هەر وایە، کەرێ (نامەیەکی) دووردرێژی لە مانەندی (بەیاننامە)یەکی نارەزایی بۆ (کۆمەڵەی دڵسۆزانی ئاژەڵ)ی ناردووە و زەراندوویەتی: (ئادەمیزاد هەر بەوەندەش نەوەستا، خۆی هەزار جۆرە خۆراکی خۆش و بەتامی قوتووبەند (معلبات)ی هەیە، کەچی هێشتا زۆر بەچنۆکی چاوی بڕیوەتە ئێمە و تەماحی لە ئالیکەجۆی ئێمەش کردووە و کردوویەتی بە (بیرە)ی چەشناوچەشن و گوشیویەتە ناو شووشەی ملقوت و قوتیی ناسك و ڕەنگینەوە و (شەوانەسوور)ی خۆی، چ لە یانەکان، و چ لە بۆنە سیاسی و ئەدەبی و هونەرییەکان و ئاهەنگە نهێنییەکانی سەرداب وباغ و بێستانەکان، پێ دەباتە سەر. یا هەندێ لە شۆڕەکچانی تازەبابەتی ئەمڕۆ، لاسایی ئێمە دەکەنەوە و جۆڕکە نازدارەکەی ئێمەیان دزیوە و زۆر بەناز و نیوناز و فیزەوە، لە دەستی دەگرن، یا لە ملی خۆیانی دەکەن، یا لەسەر سمتی خڕ و کەفەڵی دەستاڕییان شۆڕی دەکەنەوە. ئیتر نازانین چ ئازارێکی ئەم ئادەمیزادەی لە ئێمە کەرترەتان بۆ بگێڕینەوە. دەڵێن – دەمیان خۆش بێ – جارێکیان کابرایەکی ترزل و بەکەشوفش بۆ سەردان دەچێتەماڵی (شۆ)، ئەم لە ماڵ نابێ، ئەویش ڕەسمی کەرێکی دەکا و لەسەر مێزێك جێی دەهێڵێ. دوای چەند ڕۆژێ هەمان کابرا، چاوی بە (شۆ) دەکەوێ و دەڵێ: هاتمە لات، کەچی لە ماڵ نەبوویت. (شۆ) بەگورجی پێی دەڵێ: بەڵام من چاوم پێت کەوت. وا دیارە کۆمپانیا مۆنۆکەرەکانیش (کەر)ی دەم سپییان

فەرامۆش نەکردووە و هەر لەبەر دوو چاوی ڕەشکۆکەی ئەم مەخلووقە سەیرە. باشترین خامەیان خستووەتە بازاڕی (عرض و طلب)ەوە. کەس ماوە (پارکەری ٥١) و (پارکەری ٢١)ی لە گیرفان نەبێ و نەبووبێ نەخاسمە بۆ ڕاپۆرت نووسین، ئەوەی پوولە ڕەنگاوڕەنگەکانی وڵاتانی ئەورووپا و بەم دواییەش لبنانیان نەدیبێ، با سەرێ لە کۆمەڵەی ئارەزوومەندانی پوول بدەن. دەك دەستم بۆ (پوولی یەکگرتووی کوردستان) بشکی، خۆزیا. لە پاڵ ئەوەش کە قورئانی مەزن دەڵێ: "والخیل والبغال و الحمیر لترکبوها وزینة" کەچی هەندێ ملهوڕ بەردەوام موکوڕن لەسەر هیچ و پووچیی کەر و بەتایبەتیش، ڕادەی کەرەکان، بەڵام ئێمە هەندێ بەڵگەی دایلەقتیقی وامان بەدەستەوەیە کە بەرپەرچی ئەم بیروڕا ناهەق و ڕەقەن. وەك: ئەگەر کەر بەرەڵا کەیت، بەلۆژەلۆژ و ملشۆڕی و جلشۆڕی دەگەڕێتەوەماڵی خاوەنەکەی، جا خاوەنەکەی فاشست بێ یا نازی یا دیمقراتی یا وڵاتپارێز، نەك ئەمە و بەس، بەڵکو (استجابەیەکی میکانیکی) شی لا هەیە، بەتایبەتی کە بار دەخرێتە سەر پشتی، زۆر عاقڵانە ڕێ دەکات و ناشزانێ چیی هەڵگرتووە و ئەنجام بەچی دەگا. بەڵام خۆ ئەوەش هەیە، گەر بارەکە زۆر قورس بێ، ئەوا دەس دەکا بەترین و وردەئاهەنگ و هەموو نهێنی و (صفقات)ی خاوەنەی دەزڕێنی. یا گەر هەر زۆر گرانبار بێت، لەجێی خۆی فس دەبێ و (استقالە) دەکا و هەرشت بەخوێ خۆێش بەمەعنا. هەر بۆیەشە کوردی کەردیدە دەڵێ: "ئەگەر کەر نەهاتە بەر بار، باری ببە بەر کەرێ" کە ئەمە ئەوپەڕی (یەکسانی و ئازادی و دیموکراسی)یە.

کەچی هەندێ کەری (ئەزموونکەر) هەیە کە بێگانەیەك لێی نزیك بێتەوە، بەتەمای سواربوونی، جووتکەی زۆر ڕقاوی بۆ ئەوەشێنێ. کەریش هەیە دەستاڕی دینگ دەگێڕێ و گێرەی سەر خەرمان دەکا و جووتیش لێ دەدا و گاڵتەی بەهەزار تراکتەر و حاسیدە و خەرمانگێڕ دێت، کەچی زۆر لە سەگ دەترسێ. بەتایبەتی (سەگی پۆلیسی) خۆ گەر تووشی گورگیش بێ،

بەتایبەتی گورگە هارەکانی سیاسەت، ئەوا یەکجار دەستەپاچە دەبێت و دۆش! هەندێ لە دوکتۆرەکانی بەیتاڵخانە دەڵێن: "لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەتی لەخاچدرارودا، دوور نییە لە کاتی زگچوون و ژانەسەر و نەخۆشیی ئەعساب و زەختی خوێن و سێکسدا، کەریش فێری قووتدانی کەپسوولی کورسدین و ئیسپرۆ و لێبریۆم و سالیۆم دوو ڤیاگرا و سۆدە و ڤالیۆمی (١٠) ببێ.

ئەی کێ هەیە، [ناوی] کەرە بەناڤودەنگەکانی پیاوە بەناوبانگەکانی مێژووی پڕ لە ژانی مرۆڤایەتیی نەبیستبێ: کەری نووح، کەری عوزێر، کەری چاوخێلی مەلای مەزبوورە، کەری کازازاتزاکی، کەری عیسا، کەری نالی، کەری مەولەوی، کەری زەهاوی، کەری والییەکان، ماکەری بەردەشانی، کەری لاڤۆنتین، کەری جۆیس، کەری والییەکان، ماکەری ئەبوو نواس، کەری شێخ ڕەزا، کەریی دەجال، کەری، کەری، کەری، کە هەر یەکە بۆ ڕاز و مرازێ بەکاریان هێناوە، جارجاریش بۆ نیازێ سواری بوون، بیلامانی، کەرە بەیتاڵێکیش بۆی گێڕامەوە زۆر بەتامەزرۆییەوە دەیوت: "لەو نەخۆشییانەی کە تووشی کەر دەبن بەم جۆرەیە، نەخواستە گەر کەرەکە ڕەسەن نەبێت و ئەم دەستاودەستی پێ کرابێت و کورتان و جۆرکی گۆڕیبێ و لە مەزاتخانەکانی (بەرژەوەندی)دا ساتوسەودای لەسەر کرابێت:

١- نەخۆشیی مەقاو: کۆکە و هەڵامەت.

٢- نەخۆشیی جدەو: شانی گەنیو.

٣- نەخۆشیی ناوکەڕێژ: کونبوونی پشتی لە ئاستی ناوکییەوە.

٤- نەخۆشیی تەشککەوتن: قاچ لە جێ دەرچوون.

٥- نەخۆشیی گارنگ: گەڕبوون.

٦- نەخۆشیی شۆقان: پەلپەلبوونی سمەکان.

٧- نەخۆشیی لێهاتن: سندان.

٨– نەخۆشیی تەنگەنەفسی: هەناسەسواری و وردەئاهەنگ.

٩– نەخۆشیی باکردن: باوویژ کە بەداغکردنی چاك دەبێتەوە.

١٠– نەخۆشیی پەیزەنی: بەیەکەوەپێچرانی کەر.

١١– نەخۆشیی سڵەزەوە: دەرهاتنی لوولە لەشدا.

وەك بـاوە: دروشمـی پـارتـی دیموکراتـی ئـەمـەریکـایـی (کـەر)ە کـە مـانـای بـەرگـەگـرتـن و پشوودرێژیـیـە لـە تـالان و بـڕۆ و وێرانـکـاری و بـەرزەفت و داگیرکردن. پارتی کۆماریيش (فیل)ە کە مانای پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەگەیەنێ. جارێکیان لە خروشۆفی نامەرحوومیان پرسی: چ فـەرقـێ لـە نـێوان ئـەم دوو پـارتـییـەدا هـەیـە؟ لـە وەڵامـا بزەخـەنینـەیـەکی (کەرمەلینانە) گرتی و وتی: هیچ فەرقێکی ئەوتۆ نییە، ئەم (کەر) و ئەویش (فـیـل) ڕای دەکـێشێ و بـەکـەر و فـیـلـەوە، پـارێزگـاری لـە کـەرتـلـەکـان و لووبییەکان دەکەن و هیچی تر؟

لای خۆشمان، کە بەڕای من فابریقەی هەموو شتێکی سەیر و سۆبەتە، کە نێرەکەر بۆنی میز بکا، دەزانێ ئەو میزە بۆنی نێر یا ماکەرە، خۆ گەر هی مەها بێت، ئەوا بەستەزمانە، جارێ لە پێشدا سێ چوار جار سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە و چاو لە قوبەی شین گیر دەکات، ئینجا ددانەکانی گڕ و چەنەی بۆ دەگرێ، هەزار نەقیزەشی لێ دەی و بەسیخورمە برینداری کەیت، ئەو بەلایەوە پەشمە، چونکە وەك ئیسپات بووە نرخی کردن و لەزەت لێ وەرگرتن و تەوژم تێوەژاندن و بەتامهێنان و بردن و بەهەناسەبڕکێ ڕژاندنی، هەر کەر دەیزانێ و بە(حاسەی شەشەم)ی خۆی ئەوەی لە بیر نەکردووە کە ئەمڕۆ (تەوەرە و سەنتەر)ی هەموو مەسەلەیەك، هەموو بابەت و وەزیفە و مایەیەك بووە بە(سێکس) و لەسەر ئەو (تەوەرە)ەدا دەخولێتەوە، مـەگـەر هـەر یـۆنـاسیس و جـاکلین و ئـەفسەرە شێت و هـار و سۆزانـیـیـە قوزدڕاوەکانی کۆشکە کۆمارییەکان، سیاسەت و کۆمپانیاکانی (استیراد و

تصدير) و (فندقەکانی ٥ ئەستێرە) بیزانن و دەرك بەتام و بۆی بکەن.

دەڵێن: بۆ زانینی مێرخاسیی کەر، گەر هات و تەقەی لێ کرا و ئەویش گوێی مووچ کرد، ئەوا هێشتا جاشە و گەنج و سەرکێش و بەپێی زاراوەی ئەمڕۆش (شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر)ە. ئەگەر نا، ئەوە پیرەکەرە و بۆنی خورمای لێ نیشتووە و بۆ کاروانی پڕ لە هەڵەت و هەوراز و لێژ و هەڵدێر دەس نادات و دەبێ (کەنارنشین) بکرێت. جۆرێکی تر هەیە (کەری مەدار)ی ناوە و لە کار ناکەوێ، با هەزار جار ئاش و ئاشەوانیش ڕابووەستن، ئەم هەر بەردەوامە و هیلاك نابێ، چونکە بڕوایەکی پتەوی بەسووڕانەوە هەیە، لە دەور و فەلەکی هەر شتێك و کەس و تاقمێکدا بێت، وەك دەروێشی حەڵقەی زیکری لێ هاتووە و لە حەلوەلا زیاتر هیچی تر نازانێت، دەك هەزار کورتانی پڕ لە نوور لە قەبری گالیلۆ بێت. هەزار نەعلەتیش لە (مەحکەمەکانی تەفتیش).

جارێکیان کابرایەك، مەلا مەزبوورەی دی پاڵکەوتووە و لاقی هاوێشتووەتە سەر لاق و دەستی (چەپ)ی لەسەر گونی داناوە و بەوردی لە گۆوارێکی جنسی دەڕوانێ، کەرەکەشی لە دوورەوە بەدۆڵکە لە بیر ئاو هەڵدەگوێزێ، تا مەلا غوسڵی پێ دەرکا. کابرا زۆر حەپەسا و لەسەرخۆ بەمەلای وت:

ئەرێ قوربان تۆ بەردەوام لەگەڵ ئەم کەرەدایت؟

مەلا نەختێ بەری خۆی خوراند و وتی: نەء.

کابرا وتی: دەی چۆن دەزانی کەرەکەت دڵسۆزتە و لە ئیستمراریەتی خۆی ناکەوێ؟

مەلا بەتووڕەیی دەستی خستە سەر ورگی و وتی:

– زەنگوڵەیەکم خستووەتە ملی، کە دەنگی نەهات ئەوا دەزانم زەغەڵی دەکات و لێی ڕادەپەڕم و سواری دەبم و تێرتێلاشی دەکەم.

– باشە، گەر ویستی فێڵت لێ بکات و هەر لە شوێنی خۆی سەر بابدا و دەنگ لە زەنگوڵەکە هەڵسێنێ و تۆش وا بزانی لە کار بەردەوامە؟

مەلا جرتێکی شەش بەشەشی بۆ کێشا و وتی:

– کاکی برا، گەر کەرەکە بەقەد تۆ عاقڵ بووایە، منیش چارەیەکی ترم دەدۆزییەوە. کەر کەری خۆمە و باش دەیناسم بایی چەندە و لە چ (وەزیر و گزیر)ێك دەرسی وەرگرتووە.

جارێکیان لە وەڵامی کەرەئەدیبێکی لبنانیدا شاعیرێکی کەراسا وتوویەتی: ″لو کان شعری شعیر لأکلته الحمیر، لكن شعری شعور، هل للحمیر شعور؟″ کە خۆی لە خۆیدا پەندی (کەر و شیعر و بانگدانیان نەوتوو) دەسەلمێنی.

ئای، کە جێی هەزاران لووشکەوەشاندنە، کە تا بەئەمڕۆش دەگا. باشترین کۆواری ساوا و منداڵان. بەکاریان هێناوە و دەڵێن: ″ئەو کەرە چ کەرە؟ کەری میری ئەسکەندەرە، بەقان و قوون و کەمبەرە، ئالیکی نییە بۆ خۆت بەرە. تەحا لە ساڵی منداڵانی جیهان و مافی منداڵان و دنیای جەژنی پاکی منداڵان.

خەونناس و سیحربازی مەزن، دانیاڵ، کورتانی کوردی لە کۆڵ بێ، ئەم هەموو خەونناماکانەی بۆ ئەوانەی کە کەر لە خوێنیاندا دەژی و لە خەوندا دەیبینین، داناوە بەلای دانیاڵەوە گەر یەکێ کەر، کەری موتڵەق، لە خەوندا ببینێ، ئەوا مایەی بەختەوەری و جووتەوەشاندێکی شاعیرانەیە لە نێو پارە و پایەبەرزیدا. خۆ گەر دیت کەر لە (ڕاست)دا دەزەڕی ئەوا دەرگای خێر و بێراتت لێ دەکرێتەوە، گەر زەڕینەکەش لە (چەپ)بوو، ئەوا لە قوڕ دەچەقیت و مایەپووچ. لە خەونا. کەری بارکراو مانای سوودێکی گەورە دەدا، بەڵام گەر لە کەر بەربوویتە خوارەوە و کورتانەکەشت کەوتە ژێر دەعبای کەرەکە، ئەوا هەموو پارە و مارە و قەسر و قەمەرە و سەفەر و مەفەری ئەورویات لە

کیس دەچێ. خۆ گەر دیت، لە خەوندا، کەر جووتەت بۆ دەهاوێژێ و پێ دەکەنێ، ئەوا یەکسەر خۆت بۆ حەیاتکان و ڕووزەردی ئامادە بکە، بەڵام گەر (کەرگەل)ت دی. لە خەونا، ئەوا دڵگوشاد و مەست بە، چونکە ماڵ و بەهرەیەکی زۆر زۆرت چنگ دەکەوێ. هەر لە خەونیشدا گەر تووشت بوو بەتووشی کەری ڕەش یا سپی یا سوور، ئەوا یەکسەر عەمبازێ بدە و سواری هەر کامیان بیت، ئەنجامەکەی سەرفرازییە و هەموو جۆرە گەورەیی و بەمەرام گەیشتن و (ئەمن و ئاسایش)ێکی دەرەوە و ناوەوەت دێتە دی. خۆ گەر کەری ئاوس و تێنگاوتینگبووشت بینی، ئەوا زۆر بەشادمانییەوە بەپیرییەوە برۆ، چونکە مایەی زاوزێ و پەلوپۆدەرکردنی (بەرژەوەندییە تەسکەکانتە)، بەڵام خوانەخواستە گەر کەری (یەکچاو) یا کەری (چاویلکە) لە چاوت دی، ئەوا چاك بزانە، کە تێکچوونێکی گەورەی خوووڕەوشت و (مقاییس) لە کایەدایە و دز و جەردە و ڕێگر و ساختەچی دەمامکدراو دەبن بەکاربەدەستی شار. بەڵام گەر دیت کەر بەپێی تەحەوللاتی حەزاری و ئابووری، بوو بەحوشتری هیندستان یا ئەسپێکی ڕەسەن، ئەوا مانای وایە، گوزەرانییەکی خۆش و ڕابواردنێکی بێ لەکە، چاوەنواڕی بەشەریەتە، خۆ گەر، لەخەونتدا، کەر ببێتە مەڕ، ئەوا چاك بزانە، کە دیوەخانە و نووسینگەکەت بەردەوام پڕ دەبێ لە هاتوچۆکەر، نەخوازەڵا ئافرەتی جوان و جۆکەر. خۆ گەر دیت کەر بچووك، بچووك بووەوە و هەڵفڕی و کورتانەکەیشی بوو بەبۆمبایەك و کەوتە سەر (بنەکەیەکی کیمیاوی)و و تەقاندی، ئەوە سوور بزانە ئاسمان و ڕێسمان خێر و بەرەکەتی بەسەردا دەبارێ و ڕژێمە گەندەڵەکان لەناو دەچن. بەڵام گەر دیت دزێك ڕەشمەی کەرەکەتی ڕاکێشا و بردی، ئەوا دەبێ زۆر ئاگات لە ژن و خوشك و دایك و خزمانت بێ، ئەگینا ناڵی پەشیمانی دەگەزیت، خۆ گەر لە خەونیشادا کەرت (گ) یا کەر (گ). ئەوا بێ چەند و چۆن هەموو ئارەزووەکانت پێك دێت. خۆ گەر خوا کردی، ئەوا بێ چەند و چۆن هەموو ئارەزووەکانت پێك دێت. خۆ

گەر خوا کردی، دەك خوا بیکا، خۆت بوویت بەکەر و کورتانێکی تازەبابەتی فابریقەکانی تورکیا و ئێران و مۆسکۆ و واشنتەن و لەندەنت کردە شان، ئەوا هەر حەوت دەرگاکەی خۆشی و خۆشبەختی و ڕابواردن و مەزنی و ڕابەرایەتیی کەرانت لەسەر دەکرێتەوە.

وەنەبێ بەکارهێنانی جوێن و تەشەر و قسەی ناشیرین لە دەسکردی ئەم دەوروزەمانە بێت، کە بەجوێن نەبێت چارەی ناکرێ و بەس، بەڵکو کاتێ یۆهان ڕایزی کەرەجەرمەنی ئامرازی تەلیفۆنی داهێنا کەس بڕوای پێ نەکرد، کەچی کە لەبەردەم کۆمەڵەی فیزیاناسانی فرانکفۆرتدا تاقیی کردەوە، بەمیکرۆفۆنەکەی بەردەمی وت:"ئێوە... ئێوە، ئێوە هەر هەموو چەند کەرێکی گێژ و وێژن، ئەی بەرێزەکان!" هەر هەموویان حەپەسان و قبووڵی کەرایەتی و کەرئەژدادیی خۆیان کرد. وا دیارە هەندێ کاربەدەست، تا بەدە قاڵبەسابوونی سابوونکەران نەیشۆیتەوە و بەجوێنی خەستوخۆڵ لە گۆڕی ڕەچەڵەکی نەبەیت، باوەڕت پێ ناکا. چاکیشە هەر لێرە یەك لەو جوێنە هەرە بەتامانەی نێو دنیای کەرایەتی بۆ ئەو چەشنە کاربەدەستە قورمیشکراو و کاربۆنیانە هەڵگریت و بڵێی: ئەگەر (مانگۆز) بریتی بێ لە (٤) گەواد. ئەوا (پنتال) دەبێ (٤٠) مانگۆز بێت، خۆ گەر (مافلونێك)یش (٤٠) پنتاڵ بێت، ئەوا (ختوول) دەبێ (٤٠) مافلونیگی بێ. دە وەری گرە هەی مانگۆزی کوڕی پنتاکی کوڕی مافلونیگی کوڕی ختوول دەك بۆ ئەو ڕۆژەی بەسواری کەرێکی لەڕەوە، خۆڵ و دۆت بەسەردا دەکرێ و لە نێو حەشاماتە داخلەدڵەکەدا بەزەرەزەر زیرەت لێوە دێ.

بەم دواییە دوو کەسی لە دیدەرچووی سەر بەکۆمەڵەیەکی گومان لێکراو، پاکستانییەك و مەلایەکی ئەزهەری، کە لە ژێری ژێرەوە لەگەڵ کۆمپانیایەکی عەرەقدا، دەستیان تێکەڵاو کردووە، بڕیاریان داوە: بەڵێ عەرەق حەرامە و نابێ بخورێتەوە، کەچی لە ئەنجامدا بەدووان فتوایەکیان

دەرکردووە، کە لەسەر شووشەکانی عەرەق بنووسرێت: (شەرابە جۆی بێ کحوولیات)، بۆ ئەمەش هەر یەکە چوار قاپە شەراب جۆیان خواردووەوە و ئەنجامەکەشی وا کەوتووەوە:

١- پاکستانییەکە لە جیاتی ئەوەی دیژداشە لەبەر بکات، کورتانێکی ڕازاوەی هاوێشتووەتە سەر شان.

٢- کابرای ئەزهەریش لە جیاتی ئەوەی گۆرانییەکی (ام کلثوم) بڵێ، زەڕاندوویەتی.

٣- پاکستانییەکە، کاتێ لە نێو بانیۆدا لە قەحپەیەکی خۆی زویر بووە داویەتە بەر جووتە.

٤- کابرای ئەزهەری، لەجیاتی ئەوەی مەسینە و مێزەرێك بەدیاری ببا بۆ ماڵەوە یەك ڕبە جۆی کڕیوە.

ئا، هەر لەبەر ئەم عاجباتییەشە، شاعیرێکی قەپۆزشکاوی بەرجووتەکەوتوو، دەڵێ:

**صبرا على الذل والصغار　　من خالق الليل والنهار**

**كم من حمار على جواد　　ومن جواد على حمار**

دەك دەم خۆش بۆ خۆت و بۆ جووتەوەشاندنی کەریکاتیریستت، هەی کاکی شاعوور، دەك (...)ی کەر بە(...)ی (...) کە میز دەکا و دەگری، دەك (...)ی (...) لەسەر دەرپێوە بە(...)ی نێرەکەر تا سوێی بێتەوە.

ئا ئەوەتانیش، هەر لەبەر گوێی درێژ و ناڵەبار و پڕ لە سم و نسکۆی دیپلۆکەرایەتیی نێو دەوڵەتان، ناوی گەلێ لەو باڵیۆزانەی کە کەر بەکونە دەرزیدا دەکەن و جۆ بەدیوارا هەڵدەگەڕێنن. ناوی موبارەکی ئەم (شتە) سەیرەیان لەتەك خۆیاندا پەلکێش کردووە کە ئەم مشتە نموونەی جۆرکێکە:

باڵیۆزی ژاپۆنی: چەندیها کەریان چەندیهاها.

باڵیۆزی ئیتالی: سنیۆر ئەمیلۆ کەرۆ.

باڵیۆزی ڕووسی: کەریاترسۆڤ و خاتوونەکەی کوزکی قەشاویشۆف.

باڵیۆزی ئەمریکایی: مستەر کەرندێرا و خاتوونەکەی سوزان مێکێر.

باڵیۆزی فەرەنسی: مسیۆ ژووژوو کەرکی و خاتوونەکەی کوزها سمدار.

باڵیۆزی ئینگلیزی: مستەر ئەپۆکێروکەر و خاتوونەکەی ئۆڤیلیا کێردار.

باڵیۆزی ڤێتنامی: گام کوزەکەر گام.

باڵیۆزی چینی: کەرنای گا.

باڵیۆزی کوێتی: احمیر فریخ ال الصباح.

باڵیۆزی ئوردونی: عبدالماجد الحمامیری.

باڵیۆزی جزایری: مضیاك بوحمیر.

باڵیۆزی تورکی: رفعت ایشك اوغلو.

باڵیۆزی ئێرانی: انتصابی قائم خر.

باڵیۆزی عێراقی: مگوار ابو زمال.

باڵیۆزی بەحرانی: عبدالله زب الحمیر.

باڵیۆزی سعودی: مظروط المضیریط.

باڵیۆزی زامبی: داود ناڵ ناڵ.

سەرۆکی گۆنگرەی بێلایەنی: جیو جو کڕش کڕش.

دەڵێن دوکتۆر فرانکلین زەڕاندوویەتی: لە شاری شێرتەرس، کەرێ هەبوو، زۆر حەزی لە (ئاواز و گۆڕانی) دەکرد، بۆ ئەمەش هەر جارە دەچووە لای تەلارێك کە خانمێکی نازداری لێ بوو، یەجگار دەنگی خۆش بوو، مێردیشی هەبوو، زۆریش حەزی لە دەسگەمە و شت گەمە بوو. ڕۆژێ کە ئەو خاتوونە بێوەژنە هاتبووە چریکاندن، کەری گۆرین لێی چوو بووە ژوورەوە و

لەبەردەمیدا تێر تێر گریا بوو، ئەمیش دەستی لە ملی نابوو، ئەو شەوە تا زەردوزووری بەیان دەسلەملانێیان کردبوو، بوو، بوو، بوو، چوو، چوو، چوو، دەشڵێ ئەو کەرە وەسیەتی کردبوو دوای تۆپینی، پێستەکەی بغارن و بیکەن بەفەروو بۆ سەر شانی ئەو بێوەژنە ئافرەتە تەڕ و ئاودارە.

دەشڵێن، کەر هەروەك چۆن حەزی لە مۆسیقایە، بەهەردوو باندی ڕۆژاوایی و ڕۆژهەڵاتی، دەئاواش حەزی لە (عەرەق) خواردنەوەیە و فێری بێ، تەرکی ناکا. گوایە: کەمانجەژەنێکی مەیخۆر هەبوو، هەموو ڕۆژێ بەسواری کەرەکەیەوە دەچوو مەیخانە و تێر تێر مەی دەنۆشی، کە دەریش دەچوو، چارەگە عەرەقێکی دڕژاندە قورگی کەرەکەیەوە و ئینجا بەدووان، ئەم بەزەڕاندن و ئەویش بەکەمانجەژەنین دەگەڕانەوە تەویلەکەی خۆیان و هەزار خەونی جرنی و فڕنییان بەدوارۆژی بزووتنەوەی هونەرییەوە دەبینی دوای ماوەیەك کابرا و لەلایەن (هەڤاڵ)ە دڵسۆزەکانی زۆر سەرکوێر و هەناسەبڕاو کرا و لە ئەنجامیشدا لە (سەندیکا) دەرکرا، ئەمیش بەناچاری وازی لەو بەزمی مەیخواردنەوەیە هێنا، کەچی کەرەکەی بەم بارە نالەبارە ڕازی نەبوو، هەر جارەی کە لەبەردەم مەیخانەکە ڕەت دەبوون، گڕنگەی دەگرت و دەغەزری و نەدەڕۆیشت و کەمانجەژەنی خەمگینی هەراسان کردبوو. ئەمیش دوای ئەوەی لە نهێنییەکە گەیشت، ناچار قەرسەقولەکەی کۆ دەکردووە و دەیفرۆشتە باغەوانی ماڵی حاجی چەرمەکەر و پارەکەی بۆ دەدایە چارەگە عەرەقەکە و زمانی حاڵیشی دەیوت:

**من عەرەق دەخۆم کە بی کەدەر بم**
**کەمێ لە دنیای دوون بێ خەبەر بم**
**گەلێ سزام دی لە ڕێی عەقڵەوە**
**با نەختێ بۆ خۆم بێ هۆش و کەر بم**
**نامەوێ بەرگی ڕیا و زاهیدی**
**ئەگەر بەو بەرگەش زۆر موعتەبەر بم**

«توخوا ئاوەکە، ئاوی ئاوەکە، ئاوی ناو ئاوی ئاوەکە، کەمێ لاوەکە، بۆ سەرچاوەکە، لەبەر کەرەکە، بۆ ماکەرەکە، بۆ ماکەرەکەش، لەبەر کەرەکە، تەحا.»

گەر هاتو خوای بەهێز، بەقوربانی بم، هەندێ هێز و تاقەتی پێ دای و تۆش ویستت لە نێو دیوانی سەرزلی شیعری کوردیماندا پیاسەیەك، یا گەشتێك لەسەر پشتی تەبەش و لووسی کەر بکەیت، ئەوا بێگومان نەك هەر زۆر (دڵشاد) دەبیت و بەس، جووتەی (سەرفراز)ی دەوەشێنی و بەس، بەڵکو یەکجاریش (سەرسام) دەبیت لە زۆریی ناوی کەر، لە لای (٩٩٪)ی شاعیرانماندا، ئەلا لە شاعیرانمان، لەوانەشە ئەوەندە (بێخەو)ی داتگرێ و هەست بە(ئاوارە)یی بکەیت و (خەزنە) کانی بیر و کەماڵت بشێوێ. دوور نییە گەر نەختێ لە هاژە و هووڕ و ژیان (پەرۆش) بیت، ئەوا هەر یەکجار (بێبەش) دەبێت و بە(شەیدا)یی (هەڵمەت) بۆ تری کەریش ببەیت و (شوان)ی بۆ قوزی ماکەریش پێت ڕەوا بێ و بەهەموو شتێ (قانیع) بیت و بە(خەمبار)یش (ئەژی) و بە (خامۆشی) لەقە دەوەشێنێ. بەڵام ئەمانە بەلای منەوە، نەك هەر تەنیا، نرخاندنێکی شیعری و ئیستێطیقییە، بۆ کەر و دەوری پڕ لە (مسئوولیەت)ی (مێژووی)ی کەر، بەڵکو لە حەقیقەتدا ئەمان، شاعیرانمان باشترین (شارەزا) و دەمڕاست و (جوتیار)ێکی ئەم زەوییە بەیارەی کەری (دەشتی) و (دێهاتی) کوردەوارین، لە دۆزینەوەی قەفە ئەلکترۆنییە نادیار و ئاشکراکانی نێوان دنیای (بێگەرد)ی کەر و دنیای (پەژار)ی ئادەمیکەر، ببوورن، کەرادەمی یا کەرادەمیزاد، دە وەرە لەم چاپەرەدا سەیری شێخی خۆمان، قدس الله، بکە و بزانە دەربارەی شیعر و شیعراندن و دیوانەشیعر و میعر چی فەرماندووە:

**چونکە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا**
**بۆتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا**
**(لەم شارەدا) فەرقی نییە.**

خۆ گەر مامەڕەزام گوڕهەڵتەکێنێ و گوێی مووچ بکا و لە سیلەی قەبر و

بەچاوی زەقەوە، سەیری حەشری نێرەکەرانە و ماکەرانەی (میعری کوردی) ئەمڕۆ بکا، چی بەدڵ و خەیالا دێ، مەگەر هەر لەگەڵ کوێر و کەرەشاعیرەکەدا، ڕەق و ڕێك، ڕەقتر لە هینی کەر و، ڕێکتر لە وانەکی ماکەر بڵێ و نەوەستێ:

**کەر شەوقی زەڕینی نییە. حەتتا لە بەهاردا**
**ترسی هەیە، نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە**

هەر لەتاو پادشاگەردانی (تیوریی مەعریفە)ی بێماریفەت و لە قوڕاگاینی هونەر و بەهرە و جوانی و گۆشت و بۆ نانەواو و نان بۆ قەسابدا و شاعیرێکی کتوکوێر و بەدەنگی کە لە دەنگی نێرەکەر قەبەتر بێ هاوار بکا:

**شەرتە کەر بم بارە گوێزم لێ بنێن خرەی نەیێ**
**با دەمێکیش زۆر و کەم وەك بێخەمێ بۆ خۆم بژیم**

کەرەشاعیرێکی تریش، ڕەقتر و زەقتر و ڕەپتر بزەڕێ و بڵێ:

**کەر لەبەرچی ناوی بەد بوو، هەر لەبەر ئینسانی کەر**
**کەر دەبێ چی کردبێتن، وەی دەنا دەمزانی گەر**
**پیاوی لێمان کوشتووە، یا خاکی لێمان ساندووە**
**خۆێنمژ و زۆردارە، ئاخۆ، وەك کەری دوو پێ مەگەر**

شاعیرێکی تریش دەنقێنێ و دەڵێ:

**کەری نووحی نەبی باپیری ئەم بوو**
**لەگەڵ گوێدرێژی عیسا، خاڵ و خوارزان**
**بەلاشە بەرز و زگ ئەستوور و سەر زل**
**کەفەڵ گورج و پەراسوو چیخ و گوێ پان**

ئەی چ کاریکاتێراندنێك ئەمەندە سفت و جفت و لفت، لە شیعری (کەراسیکی)دا بەر ناڵ و سمت دەکەوێ:

**عەبا و کەر، فێست و ڕێوی، ورچ و شەفقە، مێزەر و مەیموون**
**حەیا و کوێر، شەرم و دۆم، قەحپە و وەفا، نامووس و سۆزانی**
**هەموو شێر و پڵنگن وەختی نان خواردن لە ئەترافت**
**سمێڵ بابڕ، کفن دڕ، کەللەخڕ، پەرچەم (مەریوانی)**
**لە کوێت دۆزینەوە، ئەم کوێر و قۆڕانەی لە خوا (عاسی)**
**چلۆنت کەوتە خاتر، مشکەکوێر و جورجی (کوێستانی)**

شاعیرێکی تریش دێ و مۆڕ دەبێ و ئینجا دەزەڕێ:

**گەردوون کە بەزانیاری بکردا کاری**
**چۆن وا پڕ دەبوو، لە هیچ و پووچ و خواری**
**کەی ڕاستە هەژار و لێوبەبارن (زانا)**
**بێ مێشك و کەریش، لە زێڕە ناڵ و باری**

هەر بۆیەشە، ئەو حاجییەی کە هەزاران جووتەی بەر شەویلاکی کەوتووە دەزەڕێنێ:

**حەقیقەت گەر بزانی یا نەزانی**
**وەکو کەر، دەچییە بن باری گرانی**

هەی هەی، لەم ناز و فیزە کەرانەیەش، کە دەزەڕێ:

**بەدوور ریخە. سیاسەت، وا دەگیرێ**
**نە پرخەی دێ نە مرخەی دێ، نە لرخە**

دەباشە! ئەم مەتەڵەم بۆ هەڵێنە: (کەری شین کەربەندی شین، دام کوتا لە مێرگی شین،) تا دوو مشت قەرسەقوڵت دەمی.

لە تاوی ڕشانەوەی هەندێ ماعیری چەقاوە (کەر)، شاعیرێکی کۆنکرێتی سوسیالیستی سێکسیی تازەبابەت، ئاوا باسی یارە ئازیز و دڵدار و نازدار و جوان و دلبەر، کەی خۆی دەکات و بەوپەڕی (سەراحەت) دەڵێ:

بەقوربانی ئەو لووتەت بم، هەر دەڵێی خەرتوومی فیلە
بەقوربانی گەردنت بم، وەك قورتمی کەڵەشێری بەرازیلە
بەقوربانی کەمەرت بم، پڕ بارستاییی بەرمیلە
بەقوربانی ناوگەڵت بم، دەڵێی بەحری دەردەنیلە
بەقوربانی گەرمییەکەی بم، دەڵێی شافی زەنجەفیلە
قوربانی تووکی بەرت بم، وەکو پەمووی دەلتای نیلە
دەتۆش جارێ، بەقوربانی ئەوەی من بە
دەڵێی: (...) نێرەکەرە و بەقەد لایتی شەش پیلە

چەقاوەسووێکی تریش بەتەوسەوە بەیارە هەڵچووەکەی دەڵێ:

کاتێ دیواری (قـ..)ی تۆ، هەرەس دێنێ
خەیاڵاتی سیاسەت و کەرایەتیم
وەبیر دێنێ... ئحم... م م م م م

دە تۆ وەرە سەیری ئەم ترەشاعیرە بکە و بزانە:

ئەها ملم لە دەزووی بەغا قرچۆکترە
ئەها سمێڵم لە باسترمە ئەستوورترە
ئەها گوێچکەم لە چیمەنتۆ گرانترە
ئەها چاوم لە دەللوبیبەر تیژترە
ئەها زمانم، لە سابوونی ڕەقی لووسترە
ئەها (...)م، وای لە (...)م
لە کەللەم و هی نێرەکەر، ڕەقترە
ئە... ئە... ها
ئەها
ئەها
ئەها

**ئەها... ئە... ئە... ها ها ها ها... ها**

هەر لەم زرمەزلە و شینایییەشدا، شاعیرێکی (بێ ئەدەب و بەئەخلاق) وتوویەتی:

**بەقوربانی قیتکەی سوورهەڵگەڕاوت بم**
**بەقوربانی درزی ناسکی سواوت بم**
**بەقوربانی درەپێی زەردی**
**شۆراوی بەر هەتاوت بم**
**ئازیزەکەم**
**لە کەناری گۆمی (قـ..)ی وشکبووتا**
**ماسیی سیس و مردووم بینی**
**پاکیزەکەم، خۆت دەزانی**
**مەبەستم کامە ماسییە**
**دە تۆش جارێ**
**تەنیا جارێ**
**بەس پێم بڵێ:**
**بەقوربانی دەعبای کەری ڕووشاوت بم.**

لە تاوی هەندێ مامۆستا ڕوکن و ورگن و قرخن و ڵغەڵغکەر، ئەم شاعیرەش هەڵدەشاخێ و پشتگیری لە نەوەی ژانکەر دەکا و دەڵێ:

**سەیری مامۆستا بکەی هەر زوو دەزانی نەگبەتە**
**پیرخواه و کەرپەرست، نەفرەت لە لاوی ژیرەکا**

پیرەکەرێکی تریش هەر بەشیعر، ڕەخنەیەکی مەوزووعییانەی ڕیالیستانەی سۆسیالیستانە هەڵدەخا و دەڵێ:

**لە کردەوەی خوا سەرم سوڕماوە**
**مەخلووقی چۆنی خستە ئەم ناوە**

**مــاری هــێنــاوه، زستــان بــتــەزێ**
**بــەهــاویـنــانیش، عـالـەم بگـەزێ**
**دووپشکی هێنا، کوێری بێ حەیا**
**بــێ قــڕە و بــڕە، بــەخـەڵـکەوە بـا**
**ئەوەی بەکەڵکە و بێوەییە کەرە**
**هــەم بــێ زمـانــە، هــەم بـارەبــەرە**

ئای مامۆستاش کە هەمیشە (کەر) لەمێشکیدا پێوانەیەك بووە و چاکی بۆ چووە کە دەفەرمێ"

**ئــەم عــێراقــە، دوڕگــەی واقــواقــە**
**کام گەورەی تاقە، کەری دوو لاقە**

بەڵام جووتەیەکی تر، لە شاعیرەکی ترەوە دێت و دەڵێ:

**باخی جەننەت وا نەزانی، بۆ کەر و بۆ گا دەبێ**
**وا دیارە (کەر) نەسیبی، هەر لە پووش و کا دەبێ**

شاعیرێکی (بێوەی) و (گوشاد)یش ئاوا بۆ کەرە گورگ خواردووەکەی دەلاڵێتەوە:

**بەناو کەر بووی نەك هێستر بووی**
**لــە بــرایــەکـم ئــازیــزتـر بــووی**
**بەختی ڕەشم لە دەستم چووی**
**داخــــــی گـــــرانم کــــــەرەدێز**

(بەهرە)کەرێکیش، ئاوا (کەرداری) لەتەك کەرەکەی دەکا و دەچڕێ:

**دەنگ و ئـــــاوازی بــــــەسۆزت**
**ڕێك و جـــوانـــیــی قــەپــۆزت**
**کـلـکی کورت و گونی گەورەت**
**مــاکــەر دەسووڕێن لــە دەورەت**

ئـەی کـەرەکـەم، بـاوانـەکـەم
کـلـکت دەگـرم، بـەدەستـەکـەم
مـاچت دەکـەم، سوارت دەبم
جارجاریش قۆشمەت پێ دەکەم

لە چامەیەکی زۆر درێژی بەقەد گوێی کەر درێژتریش، شاعیرێکی (هەر-وامی) گلەیی لە دەس گورگە بۆر دەکا کە (هەر)ەکەی خواردووە و ئەمە پاژێکە لە گیانی پاکی ئەو کەرچامەیە کە دەڵێ:

کـەرەڕەشم ڕۆ، کـەرەڕەشم ڕۆ
بـاوکـی گشت کـەران، کـەرەڕەشم ڕۆ
مەئیووس نە بەهار هەم بێ بەشم ڕۆ
لە ئەسلی کەران زەنگ حەبەشم ڕۆ
خوێنی کەرەڕەش قەت نابێ تەمام
گـەرەکـمـە جـەتـۆ بـاقـی و السلام

گورگەش دەڵێ:

ئـەسڵ و نـەسەبم مـەپـرسە ئـەحـواڵ
دوو ساڵەن دیلم لە شوون کوردە ماڵ
وەلـێ مـن زادەی خـاکـی خـۆشنـاوم
لـە عـەشرەتـی خـۆم، وەرق تـۆراوم
تـەنـیـا مـن غـەریب هـام لـەم وڵاتـە
هـیـچ بـاکم نییـە، قوربـان لـەم واتـە
چوون ئەوەند میشەك کوردانم وەردەن
قەد ئارەزووی گۆشت (کەر)م نەکەردەن
(حي على الصلاة) ئێمە کە گورگین
دایم لە تەعقیب (مەعاش) و (ورگین)

لە بارەی سایکۆکەرایەتی یا دەروونناسیی کەرەو، یا زانستی ناسینی کەر، یا کەرەزانستییەوە، شاعیرێکی شڕوشێواڵی کورتانلەشان وا بەجوانی و بەقووڵی بۆی دەچی، مەگەر ناڵێم زاناکانی ئاسمان بۆ باری دەروونیی کەشتییەوانە دەبەنگەکان بچن، یا (ڕێزمانەوان)ەکانی لای خۆمان – زمانیان لاڵ بێ – بەم جۆرە لە ڕێزمانی دیالێکتە شفتەژێکان بگەن، فەرموون:

**کورتانی جاشێ بکەی لە حەریر**
**ئاخوڕی پڕ کەی لە خورما و پەنیر**
**خواردنی ئاو و شەکراو و شیر بێ**
**کەرەوانەکەی زۆر سرك و ژیر بێ**
**جوبرائیل بکا شاڵ و قاشاوی**
**ئەفلاتوون بدا ئالیك و ئاوی**
**تێری خوارد لە (جۆ) هەڵدەتیزێنێ**
**سەر و گوێلاکی خەڵقی دەشکێنێ**
**قەسری (کەرملین) جێگەی بێ بەشەو**
**بەمۆسیقا و عوود گەر بیخەیتە خەو**
**کارەبای ئایسی چلچرای قەدیم**
**لە ژوور سەریا بێ لێی بدا نەسیم**
**کە لە خەو هەڵسا و قەپۆزی بادا**
**زەڕاندی دوو سێ جووتە هەڵدەدا**
**بەرەو ناو بازاڕ، هەڵدەتیزێنێ**
**سەر و گوێلاکی، خەڵقی دەشکێنێ**
**وەستای بۆ بێنی لە پارس و بەرلین**
**بۆی بدروون لیباس لەگەڵ کەمەرچین**

**بنۆشێ بادەی گولگوونی شەراب**
**مەزەی سەد نەوعی بدەیتێ کەباب**
**ساقی بەردەمی حۆری و غیلمان بێ**
**هاوینیش جێگەی لە هەورەمان بی**
**چاوی کەوت بە(جۆ) هەڵدەتیزێنێ**
**سەر و گوێلاکی، خەڵقی دەشکێنێ**
**تاجی مەلیکیی بخەیتە سەری**
**جوبەی قەزاوەت بکەیتە بەری**
**ئامیرلیوا بێ وەك زەعیم سدیق**
**ڕوتبە وەرگرێ و ببێ بەفەریق**
**ئەگەر کۆرسیل بێ رەئیسی جمهوور**
**گەر شاهنشا بێ هەروەکو شاپوور**
**چاوی کەت بە(جۆ) هەڵدەتیزێنێ**
**شووشە و ئاوێنەی، خەڵقی دەشکێنێ**
**خەڵکی لادێ بێ، یاخۆ شارستان**
**خێڵی عەشیرەت بێ، یاخۆ لە گۆران**
**هیچ دەربەس نییە، ڕووڕەشی هۆز بێ**
**گەر جاشی ساوا، یا کەری بۆز بێ**
**بەو شەرتە جل و کورتان کرابێ**
**چەند جارێ قەپی لە لەوەڕ دابێ**
**زەحمەتە ناکاو هەڵنەتیزێنێ**
**سەر و گوێلاکی، خەڵقی ئەشکێنێ**

یان جاشەکەرێکی شاعیرۆکە دەڵێ:

**کەر بەحەج نابێ بەحاجی، هەروەکو خۆی سم خڕە**
**تەفرەیان داوی عەزیزم، کێ بەتۆی کرد ئەم تڕە**

دوو شاعیری بەر جووتەی زەمانە کەوتوو، بەدووقۆڵی هەڵپەڕیون و وتوویانە:

کورتانم کرد، ئەمڕۆ بۆ تۆ
شەڵتەی جەزا بگرە و بڕۆ
بار هەڵگرە تا نیوەڕۆ
(سیاسی) بە، زۆر دەستەمۆ
بەر تۆ هەزاران عەلبە جۆ
جووتێ کەرم وا لە سووورداش
یەکێ پیر و یەکێکیان جاش
بۆ یەك (ئاخوڕ) بوون بەوێڵداش
باری خۆیان دەگرن مەعاش
بەر تۆ هەزاران عەڵبە جۆ
(سمە چەچوول) چۆپی کەرە
بۆ هەموو کارێ، جۆکەرە
چۆن سەر دەردەکەی لەم کەرە
کەرە و ئەژدادیشی، کەرە
بەر تۆ هەزاران عەڵبە جۆ

بۆ نەدی و بدی و پووڵپەرست و کورسیخواز و کچسازێکیش، کە ناکرێ و نالوێ بەبەرگی تازەوە کەر بکرێ بەشێر، شاعیرێکی چاوسوورکەرەوەی ئەودیویش دەنقێنێ:

ئەگەر گورپەبۆر، باڵی لێ بڕوێ
دەنگی بولبولمان، نایەتە بەرگوێ
گەر بدرێ بەکەر دوو شاخی گامێش
هیچ کەس ناتوانێ لێی بچێتە پێش

بۆ نەفس نزمێك و كۆرتێكدەرێكی هەڵەشە و كەرەدێزە و ترۆڵی هیچ لەبار نەبوو، شاعیرەكی قەراتی هەولێر دەكۆخێ و دەپژمێ و دەرێ:

**هـەیـتـم كـەرەكـی دێزە چ عـفـریت و بـەهـێزە**
**وەك جووتی دەكا، ڕاستە خەتی ڕیزی لە ڕیزە**
**جۆی ناوێ بەرەڵای كە لە ناو پووش و پەرێزە**
**قـوربـانـی گونت بـێ دەنـی مـەشرەب كـەرەدێزە**

***

**وەك ئەسپە سەر و گەردنی، گوێ قیت و جوانە**
**ئەمسالی نییە قەتعی لە ناو قەومی كەرانە**
**بـاكـی نـیـیـە هـەرچـەنـدی بكەی، باری گرانـە**
**قـوربـانـی گونت بـێ دەنـی مـەشرەب كـەرەدێزە**

***

**پشت كووڕ و كەفەڵ خڕەسمی چارپەلی ئەستوور**
**مـووی كـلـكـی درێژ و قـەویـیـە، لایـقی تـەنـبوور**
**كانێ هەیە وەڵداشی وەكو ئەم كەرە مەغروور**
**قـوربـانـی گـونت بـێ دەنی مـەشرەب كـەرەدێزە**

ئەمە و لە ڕۆژێكی كەرانە و كەربازاڕی بەغدا و لە گازینۆی (كەرلەمان – پەرلەمان)دا، شاعیرێكی كەرامێز ئەوەندە بەخۆشی باسی كەر و كەرایەتیی بۆ دەكردم، وەخت بوو. كورتان فڕێ دەین و باڵ بگرین و هەر لەوێدا دەست بكەین بەجووتەوەشاندن و زەڕاندن و قەپهاویشتن و زرمەزلە. مامۆستا دەزەڕمێ:

**شیوەشی كەم بێ لە خووی، هێند زۆر بووە وەڵڵاشی كەر**
**هەر سوپاسی پێ دەوێ، بۆ (ڕەهبەری) خاوەن هونەر**
**ئەو (ڕەفیق)انەی هەتاكو كەر، لە بۆ پەیدا نەبوو**
**ئیعتبارێكی هەبوو، بۆ (كەیفی بێ پارە) و خەتەر**

کەر هەتا ئێستا دروشمی خواردن و باربردنە
هیچ (شەهادە)ك ئەمڕۆ ناگەتە شەهادەی سەر کەری
بێ خەمە، دەخوا، دەنۆشێ، دوور لە عالەم، بێ خەبەر
کەر لە هەر شوێنێ بگەوزێ مێشی لێ نادۆزییەوە
کارەبای بن کلکی بادا، بای دەبێ بێ (ئێرکولەر)
جاشکێ، هەشت نۆ هەزار دیناری مانگانەی هەبێ
حەقیەتی دوو سەد هەزاری (کەر) بەجارێ بچتە سەر
دوور نییە، زەحمەت بەری لووشکەی کەرێ من ڕاگرم
شارەزامە. بۆ گەلێ شت (کەر) دەکا (سەرفی نەزەر)
کەر لەبەر بێ جۆیی ڕۆیی، چوو بووە ئەوە (جۆکەرە)
ڕێزی ناگیرێ وەکو ئەو، شێخی بەحرێن و قەتەر
کەر لەگەڵ چاولێکەران خۆی (سەربەسەر) ناگۆڕتەوە
(سەربەخۆیی) ناوێ کەر، تێیدا هەیە، زیان و زەرەر
کەر برای مانگایەکانە، دەستی بالآیان هەیە
بۆ (مەعاش و قۆنتەرات) و (شەوقوماری) تا سەحەر
کەرتریێن کەوتبایە پێش وەڵاشەکانی خۆزیا
چۆڵ دەبوو (کورسیی وەزایف) بێ ژمارە و بێ قەدەر

پێشت سەیر نەبێ و خەم داتنەگرێ و نیگەران مەبە و بیری قۆڕی کەرانەش مەکە، گەر ئەمەیان ڕاست بێ و لەگەڵ زەرینی ئەم شاعیرە جگەربرژاوەدا بزوقێنە و بڵێ و مەیبیرەوە و پێشت کرا، بەڤیدیۆکاسێت و سیدی و میمۆری تۆماری بکە و بەسەر بازاڕی کەرایەتیی ناوخۆ و دەرەوەدا بەش بکە:

ئەمە کەرمیزە دەڵێن واریسی شەرعی نەبەوین
هەموو عەبدی سەنەمن. باسی مەکە گەورەکەیان

دەك خۆزیا بەو خەرمانەی کەری لێ زیزە!

# زەڕاندنێکی دیکە

بۆ هەموو برا نووسەرو مووسەر و ڕۆشنبیر و مۆشنبیر، ڕۆژنامەنووسان و مووسانی کەرستانی کوردەواری.

بۆ گشت هونەرمەندێکی بێ بەهرە و کورتان.

بەداخەوە ئێوەمانان، دەسپێشکەری کۆمەڵایەتی و کەسایەتیی زانستی و سایکۆلۆجی گشتین لە فەلسەفەی شیزۆترینیای تیۆریی ڤیرۆسیا و شیکردنەوەی نێو جیهانی سروشت و دڕشتی و بڕشتی و تەندروستی قەرسەقوڵداریی مرۆڤ و مرۆڤایەتی لە سەرجەم فەسلەجەکان و سایکوسیماتییەکاندا. هەر فەلسەفەشیکارانەش، لە لای شافەیلەفووسی نێو خۆمان مامۆستا (ئەبستمی کەر) بیستووە، ئەو مامۆستا بەرزەی کە لە ساڵەکانی چل و پەنجاکانەوە، زەڕینی داهێنان و دەسپێشکەرییەکانی لە هێزی عەقڵی و مافوق العقلی و ئیلکترۆنی هەڵخستووە، ئەو هێز و داهێنانە فیزیۆلۆجی و ئانترۆپۆڵوجی و بایۆلۆج ئاژەڵستان و میتافیزیقیای ڕاست، ئەو شتانەی بۆ ئەم فەیلەسووکەرە لەندەهۆرە و بۆ سایکۆکەرایەتیی مرۆڤاندن و کیمالۆجیەتی کۆنایەتی و نەخۆشییە تووشەکانی نێو کۆمەڵ و ئەدەب و ژیان و ئیستێتیکا و فیکر و فەلسەفە و مێژوو و جوغرافیا و هونەر و سروشت و گەردوون ساغ کردەوە، بەتایبەتیش نەخۆشییە کوشندەکانی دایکی خۆگایین و تەنگەبینی و شەکر و کێراوسانی دوور لە تەئسیراتی ئەستاتیکی نێوان کچان و کوڕۆڵان و مێرمندالان و جاشۆڵەکانی بەر ماکیاجی تۆکالۆنە پشت پەردەکانی نهێنی، ئەمجارەیان با سەروتار ئەمە بێ و بۆ ژمارەی داهاتووش خوا کەریمە.

پەشتەماڵی کوڕی پشتەماڵ

## دوو پارچە شیعری هەڵبژاردە

## لە شیعری: کەریلۆڤێج

١

ڕیکال سوسیال کەراتیخۆف
ئەنگلوو کەرکوول تراوی
کەرتاتیخۆف... چروودی چروودی دیموکرات
کەرنیخا... میللۆ، تڕیللۆ، سیمللۆ
ڕیکال... ڕیکال سوسیالیزم،
کەرەشوودی... کەریترۆیکا، سوسیال.

٢

کێرانە هێ
کورتانە هێ
ماژنیۆم
هیوادیرۆ... پرتۆهێ کام، کەرا هێ سام
جۆڕکا هێ... کێرانە هێ... کەرانە هێ... کورتانە هێ.
ساباتێ، ئاسێ، ماتینێ
جلۆ هێ دام
ئەوەی من گام
بوو بە (مودیرعام)
مەردانێ هام
دل دڵانێ، لوشکەهانێ
بەشارەهێ، مەتارەهێ
کێرانەهێ، کەڕانەهێ... کورتانە هێ

## پرسەنامەیەکی کەرانە

لە کەرە مامۆستایەکەوە ئەم هەواڵەمان بۆ هاتووە، دەقاندەق بێ سانسۆر و مەقەستلێدان، بڵاوی دەکەینەوە، ئێمە مەمنوون.

"دوای هەشتا ساڵەی کەرایەتی، کە گشتی لە نێو بازارکەروەڕیدا بەسەربردووە، خوا لێخۆشبوو ترکەن بەگی کوڕی پاشقولگراغای کوڕی پاشگوپاشا، ئەمری خوای بەجێ هێناوە. ئەم ترکەنەش باوکی دوکتۆر جڵبەند و خاتوو سمکەر و مێخزنجیر و خاڵی تەپاڵ و پاتاڵ و ڕێژگاڵ و کورتانە و لە هەمان کاتیشا مامی دوکتۆری کۆرتاجکەری بێوەژنان و کچە ئاوسەکان، دڵبەرخان و زلحورت و ملهوڕە و مێردی کیژی قونتراتچیی ناسراو، چاوچنۆك بەگ و خوشکی خەساو بەگە. خەزووریشی وەك دەزانن ناڵدار ئەفەندی کوڕی پێڵاواغایە.

پرسە و فاتیحاکەی ڕۆحی بەدنیای کەران شادبوونی، لە تەویلەی ڕازاوەی گەڕەکی کەرنجان و بەرامبەر بەپڕۆژەی پاراستنی ژینگە و بیئەی نیشتمانی لە قەرسەقوڵ، لە سەعات چواری ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە و بۆ ماوەی چل ڕۆژی ڕێك و ڕەبەق و ڕەق، بەردەوام دەبێت. هاتنیش بۆ هەموو ڕاپۆرتنووسێك و هەپڵەگونێك و مفتەخۆر و ترسنۆك و ماستاو و وێسکیسارکەرەوەیەکە. دەشتوانن چەندین مەچەکشکێن و پیاوکوژ و پاتاڵخۆرێك لەگەڵ خۆیان بێنن.

انا لله وانا الیه... ون!

## کۆڕێکی فراوان

ڕۆژی شەمەی داهاتوو، بەرواری (١١) سەدەی سفر لە سەعات دوو هەزار و پێنج سەدی سەر لە ئێوارە، لە مێژووی تەویلەی کەرەبەرەڵادا، کۆڕێکی فراوان بۆ مامۆستا کەرگێی کوڕی سەگوەڕ، ساز دەدەرێ لە بارەی بەخێوکردنی کەر و چۆنیەتیی پەروەردەکردنی جاشکۆڵەی گەرمیان و کوێستانی کوردستانی خواروو، هاتنیش بۆ هەمووانە.

سەرنج: تکایە منداڵ و مەزم لەگەڵ خۆتان مەهێنن، نەوەك هەندێ جاشی جووتەوەشێن، لەقەیان لێ بدەن. سوپاس.

## حیوارێکی دیمۆکەرایەتی

جارێکیان شێرێك کەرێکی دی و ئەم دیالۆگە هاتە کایەوە:

– بێگومان ئەم کەرە، ئاژەڵێکی ترسناکە و لەوانەیە ڕۆژێ دابێ و ئازارم بدا و بمخاتە نێو ئەشکەنجەوە. بەکەرەی وت:

– ئەرێ کەرە تۆ بۆ سمەکەت ئەوەندە ڕەقە؟

– تا بتوانم بەسەر شاخۆڵان و گرد و تەپۆڵکان سەرکەوم.

– ئەی ئەم ددانە گڕ و قەبەیە؟

– تا کاو و پووش و پەڵاش پێ بجووم.

– ئەی ئەم دوو گوێچکە درێژەت بۆ چییە؟ ئەی ئەم ورگە زلە؟

– گوێچکەکانم بۆ قاودانی مێش و مەگەز، ورگیشم بۆ کاوێژکردن. شێرەکە مۆڕ بووەوە، سەیرێکی بادا و سەرێکی برد و هێنا:

– هەهە... مادامەکی ئەم لەشە زلەی بۆ ئەم شتە بێ کەڵکانە بەکاربێنی. دیارە ئاژەڵێکی سامناك نییە.

زۆر برسی بوو. پەلاماری دا و تێکی شکاند و خواردی. نۆشی گیانی بێ.

## چیرۆکی ژماره

ئـاسمـان تـووڕه و سوخت بـوو، تـاعـوونـێکـی کـوشنـدەی لـه نـێو هـەمـوو ئاژەڵستاندا بڵاوکردەوه و، زۆربەیان مردن و تۆپین و هەندێکی تریش له نێو تینوویەتی و برسێەتی و ژان و ئازاردا تەپاوتلیان بوو.

مام شێر ویستی ئامۆژگارییەك پێشكەێش بكات، تا ئەو ئاژەڵانه لەو پەتا پیسه رزگار بكات، وتی: "برایانی دڵۆڤان! من بیزانم، ئەم تاعوونەی كه له ئـاسمـانـەوه بـۆمـان دابـەزیـوه لـه ئـەنجامی هـەموو ئـەو تـاوان و گـونـاهـه زۆرانەدایه كه كردوومانن. بۆیه هەر كەسێ گوناهێكی له ژیاندا كردبێ، با خـۆی بـكـا بـەقـوربـانـی تـا ئـاسمـان ئـەم بـەڵایـەمـان لـەسەر لابـات و خـوای گەورەش بەزەیی پێماندا بێتەوه، چونكه مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوه، كه گەلێ ئاژەڵ لەم پێناوەدا خۆیان كردووەته (قۆچی قوربانیی،) بۆیه دەبێ خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین و باچاوپۆشی له هیچ یەكێك نەكەین و وا ڕاستیشه ئەوەی گوناهی زۆرتره، ئەو بۆ ئەم مەبەسته پیرۆزه پێش كەوێ، له پڕێكادا مام ڕێوی خۆی تێ هەڵقورتاند و بەشێرەی گوت:

– قوربان، تۆ زۆر دڵناسك و بەویژدان و بەڕێز و پاك و ڕەوشتبەرزی. تۆ كه ئەو هەموو پەزه پیس و ناڕەسەن و هیچ و پووچانەت خواردووه. مانای وا نـیـیـه تـۆ گـونـاهـبـاری... نـەء... بـەڵكو ئـەوانـه بـەلـووشانـدنـی تـۆ سەبـەرز و گەورەبوون. شوانەكەش دەبێ زۆر ئازار بدرێ، چونكه ئەو مەڕ و ماڵاتانه، دەستەمۆ دەكا و دەیاندۆشی.

بـێدەنـگـیـیـەك بـاڵـی بـەسەر هـەمـوو ئـاژەڵـەكـانـا كێشا. لـه پـاشا (دووڕووه مامەحەمەكان) له هاڕژنی چەپڵەڕێزانیان دا و گوتیان: بژی، بژی! كەسیش دوای ئەم، نەیوێرا له پرسیاری ئاژەڵه بەهێزەكانی وەك پڵنگ و كەمتیار و ورچ قووڵ بێتەوه.

لە پاشا دەور هاتە سەر کەر و جەنەیەکی بۆ گرت و گوتی:

– برسیەتی و شەیتان دووجمکانەن گەورەم، هەر ئەم دووانە ڕۆژێکیان پاڵیان پێوە نام تا هەندێ گژوگیای ئەو لەوەڕگایە بخۆم، بەمەش من ددان بەگوناهی خۆمدا دەنێم.

لە پڕێکدا هەر هەموو ئاژەڵەکان، پەنجەی (تاوانی گەورە)یان بۆ کەرەکە درێژکرد و هەزاران جوێن و تانە و تەشەری ناشیرینیشیان پێ دا و هەزاران بەڵگەشیان بۆ تاوانبارکردنی کەرەکە هێنایەوە، چونکە ئەم بووەتە هۆی پەتای ئەم تاعوونە کوشندەیە.

ئمم... ئەم کەرەی کە گیا و گۆڵی خەڵکی خواردووە... تاوانێکە و نایەتە بەخشین... دەبێ بەزووترین کات بفەوتێ و لەناو بچێ.

کاك لاڤۆنتین

# گۆشەی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن

بەپێنووسی: نالیخوازێکی قەوچەولەوچە

حەزرەتی (نالی) فەرمووییەتی:

هەیکەرێکم بوو، چ پەیکەر، تەیکەری هەوراز و لێژ
سینەپان و مووچەکورت و شانەبەرز و گوێدرێژ
بنزگ و جەبهەت سپی، کلك ئێستر و دامەن سیا
یەککەتاز و سێبر و دووباد و شەشدانگ و درێژ
کەللە وەك جەڕەی شەرابی پڕ نیشات و تەڕدەماخ
شێری نەڕ، ئاهوویی بەڕ، گورگی سەفەر، قەمچی نەچێژ
مل عەلەم، شیرن قەلەم، ئاهووشکەم، مەیموون قەدەم
سمخڕ و کلك ئێستر و مەنزڵبڕ و ئارەقنەڕێژ
زەرقوزەڕاقی وەکو خاکستەر، ئەمما بێ غوبار
بەرق و بەڕاقی وەکو پیرۆزە، لاکین بێ کرێژ
سم وەکو یەشم و لەپەشم و تووکی پێدا سەرنگوون
چاو وەکو بیجادە، یا دوو شەوچراغی شوعلەڕێژ
گوێدرێژیێ بار و کورتان بەرز و پالانی بەزێن
چوست و وریاتر لە گوێ کورتانی "پالانی و گێژ"
(قانیع)ی بابی (ڕەزا) ڕازی بەپووش و دڕك و داڵ
سالیکی سەبر و تەحەموول، بوردەبار و هیچ نەوێژ
عاقڵێ بوو، ناوی کەر بوو، قانیعی ڕێگەی سەفەر
خۆش سلووکتر بوو لە سەد ئینسانی هەرزە و گێژ و وێژ
(صائم الدهر)ی بەڕۆژ، ئەمما بەڕۆژووی بێ نییەت
(قائم الليل)س سلووك ، ئەمما سلووکی بێ نوێژ

چەندە پێم خۆش بوو (زوبانی حاڵ)ی دەیوت: (نالیا)

هەردوو حەیوانین ئەتۆ گوێکورت و ئەمنیش گوێدرێژ

لەبەردەم کەری (نالی)دا... دەستەونەزەر!

برایانی شیرین قەڵەم

خوشکانی ئاهووشکەم

شەوتان بەتام و ڕۆژتان بەخێر

لە پێش هەموو شتێکدا دەڵێم: گەر ئێوە جارێ (حەزرەتی نالی) لەبەر خۆی و لەبەر ئیعجاز و لەبەر بلیمەتیی شاعیرانەی و لەبەر خاتوو مەستوورە و لەبەر، لەبەر، خۆشتان بوێ و دەس بەسینە بۆی بووەستن و ڕدێنە نوورانییەکەی ماچ بکەن و نەیبرنەوە، ئەوا من و چەند کەسێکی وەك خۆم ئاسا، یەك لەبەر (نالی) وەکو شاعیر و ئینسان و دووەم لەبەر کەرە نەمر و تەئریخییەکەی. خۆشمان دەوێ، خۆشمان دەوێ و نایبرینەوە! نا بەڵکو زۆرجار، بەتایبەتی لەلای خۆمدا، (نالی و کەرەکەی) دەبن بەیەك شت و (وەحدە الوجود)ێك دەخوڵقێنن، کە بەهیچ کلۆجێك لە یەکتر جیا ناکرێنەوە، نا بەڵکو ئەمە لە لای مندا بووە بە(سۆفیکەرایەتی- تصوف حماری).

من بەش بەحاڵی خۆم، لە پەنای ئەو کەرە نەمرە بەهارەوە، (نالی)یم خۆش ویستووە و هەموو کەرێکی دنیاشم لە پەنای ئەوەوە ناسیوە، بەڵام. بەڵام وەك مەسەلەیەکی (خۆماڵیەتی لە فیکر و شیعر و وەستایی و (ماکەرمەلەیی و کەیفەکەرانە)ی کەری کوردستانی، بەهەموو جۆر و چەشن و قەبارە و بارستایی و ڕەنگەکانییەوە، لە لامدا لە سەرووی لیستەی ئەو ٦٥ملیۆن کەر و گوێدرێژانی جیهانەدایە، چونکە چ لە (فۆرم) و چ لە (ناوەڕۆك)دا، کەرەکە گەیشتووەتە ئیعجاز و (نالی)یش خۆی موعجیزەیە. دە کێ دەڵێ: کورد بێ موعجیزەیە! ئەم ئیعجاز و موعجیزەیەش دیاردەیەکی بەهادارە و نەتەوەی ئێمەی کوردی بەسەرجەمی مرۆڤایەتیی لە خاچدراو

نیشان داوە. ڕاستە ئێمە لە زانست و تەکنۆلۆجیا و تیۆریی ئەبستمدا، هیچی وامان نییە، تا بێین و خۆمانی پێوە ڕانێین و شانازیی پێوە بکەین، بەڵام لە (نالیۆجیا)دا، هیچ تۆز و گەردێ ناگاتە تۆز و گەردی کوردی. جا بۆ وا نەبێ دەی نابینی (هونەر و زانست) لە قەسیدە کەرانەکەیدا، چۆن سەریان کردووە گیر و هاوسەنگی یەکترین و ئەم هەگبەیە لە هەگبەکەی تر گرانتر نییە و (دەق و دەق) بوون بەیەك شت و هەزارانی وەك (فۆکۆ) و (سۆشێر) و (گوڵدەمەن) لەبەردەمیاندا دۆش و سەرسامن.

ڕاستیشە. شاعیرانی کورد، بەکۆن و نوێ و زنیدوو و مردوویانەوە، باسی کەریان کردووە و وەك شتێکی (ڕەسەن)ی نێو هیمۆگلۆبینی خوێنی کوردەواری فەرامۆشیان نەکردووە، بەڵام هیچ کامێکیان خۆیان لە قەرەی سمی زێڕینی کەرەکەی (نالی) نەداوە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا، لایەنێکی کەی لێهاتوویی (نالی)ی مەزنمان، بۆ دەردەخا. خۆ گەر (نەختێ) بەکەر و دنیای کەریش وێرابن، بێگومان، ئەوا بێگومان، هەر هەموویان لەنێو (جۆرکی) کەری (نالی)یەوە، نەك پاڵتۆ، سەریان هەڵداوە و گرەویان بردووەتەوە، ئەمەش کاریکاتێر نییە نا، بەڵکو فاکتێکی ئەدەبی و مێژووی ئەدەبیانەیە. بۆیە هەمدیس دەمەوێ ئەوە نەبوێرم و بڵێم: ئایا ئەو شاعیرانەی کە نان و کەبابی خۆیان هەڵدەگرن و و دەچنەماڵی شاعیرێکی تر و لە سەر خوانی ڕازاوەی ئەودا دەس دەکەنە (کاوێژکردن) واتە: ئەو شاعیرانەی کە خەریکی (٤) خشتەکی، (٥) خشتەکی، (٦) خشتەکی و (٧) خشتەکی و خشتەکی و مشتەکییەکانی ترن و خشتەخشتیانە، جارێ، بەخت و بەشی خۆیان، هزر و هەوەسی خۆیان، لەم تەویلەخانەیە و لەم نامەکەرانەیەی (نالی)دا، تاقی کردووەتەوە و هەر تەنیا جارێ، سەرێکیان بەماڵی ئاوەدانی (نالی) دا کێشاوە، تاوەکو بزانین فیعلەن شاعیرن یان نا؟

پڕۆژەی خشتبازی لەبەردەم ئەم ئوترووحە کەرانەیەی (نالی)دا،

سەرئاوەڵا و وازە. جا کێ دەتوانێ خۆی لە قەرەی قافیە ڕەنگین و خۆش و سوارەکانی بدات و تۆز بکات و بچێتە نێو کەش و هەواری قەرسیلەی ئەو کەرایەتییە و هەموو هێزی (عەقلی و عاتیفی و ئینفیعالی و مەجاز و کینایاتی) خۆی تێدا سەرف بکات؟ گریمان ئەمەشیان پێ نەکرا و بۆ نەلوا، ئایا دەتوانن بەهەڵەداوان بێن و (تەخبیس)ێکی بکەن. من بۆ خۆم زۆر دوودڵم، بەڵام هەر چاوەنوارین، نەخوازەڵا ئەوانەی ئەڵهای بەهەشتە ونبووەکە دەکەن، بەتایبەتیش من لام وایە، گەر کەری عوزێر بکەوێتە دوای کەرەکەی و بەلۆژە لۆژ بچنە بەهەشت، سەگی (اصحاب الکهف) یش بەهانکەهانك بکەوێتە پێش جەماعەتەکەی خۆی و بچنە نێو گوڵزاری بەهەشتەوە، ئەوا (حەزرەتی نالی و حەبیبە)کەی، بەسواری کەرە سەرسوڕێنەکەی، بەکەشان کەشان و بەوپەڕی هەنگ و دەنگەوە یاساوڵەکانی بەهەشت پێشوازییان لێ دەکەن و بەهەر هەموویانەوە، لەنێو گەرمەی چەپڵەڕێزاندا، ڕەشمەکەی دەگرن و گۆنای حەبیبە و ڕدێنی نالی و گوێچکەی کەرەکە ڕادەمووسن و دەرگەی بەهەشتیش لەبەردەمیاندا واز و والآیە!

جا گەر ئەم کەرە ئەمەندە (پایەبەرز) و جووتەوەشێن بێت، دەبووایە، بەڕای خۆم، بەپێچەوانەی هەموو داوونەریتێکی (ئەکادیمی و مەکادیمی) دەبوایە ئەم چامە مەزنەی (نالی)ی مەزن و لە هەموو لیکۆڵینەوە و دیوانە چاپ و چووپکراوەکاندا بووبووایە بەسەراغاز و سەرەتا، چونکە دوو چاو و دوو گێچکە و کلکی کەری نالی نووشتە و چاوەزارێکە، کە نالی و نالیخوازان، لە هەموو وەیشوومە و جووتەیەکی ڕۆژگار دەپارێزی.خۆزیاش بۆ ئەو ڕۆژەی کوردستانی ئازاد، کە (هەیئەتێك) پێك بێت و (مواصفات)ی وردی ئەو کەرە دابنێن و بیخەنە بەردەم (٢٠-٣٠) هونەرمەندی پەیکەرتاش، تا بێت و پەیکەری ئەو کەرە لە زێڕ و زیو دروست بکەن و لە گۆڕەپانێکی گەورەی شەقامێکی پایەتەخت یا شاری هەڵمەت و قوربانیدا،

قوتی کەنەو.! خۆزیا، دەمە چیت لێ کەمە.

بەڕاستی دەمویست درێژە بەم (بۆ چوون ناوە) بەتام و کام و سامە بدەم، بەڵام ناچارم بەکورتی بیبڕمەوە، خۆگەر درێژەم پێ بدایە. ئەوا (بڕوانامەیەك)ی باڵا و شایانی (زانکۆییم) لەسەر دەنووسییەوە. هەهەی هەر چۆنێ بێت بڕوانامەکەی من لەم کەرنامەیەمدایە و ئەوەی دەیەوێ زیاتر بچێتە بنج و بناوانی کەرایەتییەوە. دەتوانێ یا بەهەوەسێکی کەیفەکەرانە، کەرنامەکە بخوێنێتەوە، یا بەدەنگی زوڵاڵی خۆم گوێم بۆ شل بکات و بگری. براکەم: من دەزانم تۆ لەنێو چاوی منا خۆت دەدۆزییەوە، منیش لەنێو چاوی گەورۆنەی کەری (نالی)دا خۆم دۆزیوەتەوە و ئەم (گەوهەری نوکتە) یەم، بەخۆم و خۆت بەڕەوا بینیوە و بەهەردووکمانەوە کەوتوینەتە ژێر باری خۆش و قورسی ئەم کەرە موسیبەتە. خوا مانەندی زیاتر بکات و خوای (کەری نالی)یش، هەموو (نالیپەرست و نالیخواز و نالیساز و نالیبازێك) بپارێزێ.

دە وەرن با بەهەر هەموومانەوە، هەمدیس بۆ (نالیی نەمر) ببین بە(کۆرس) و لەتەکیدا شیعرەکەرانەکەی دەور بکەین و بۆی بستێنینەوە.وردەوردەش و بەئەسپایی و بەسەر یەك سمەوە واتە: (ذو البعد الواحد)ەوە، بچینە نێو دنیای ئەو کەر و چامە بڵندەوە، بەڵام دەبێ، بەعەقڵێکی تەفسیرییەوە، شوێن سمی بکەوین نەك بەهەوەسرانی و بەدیراسە و میراسەی وەسفییەوە، ئەگینا ساتمە دەکەین و گەردنمان دەشکی.

* سەیرکە لە دێری یەکەمدا، سێ جار بەپاشگر (کەر)، ناڵی ناوی کەرەکەی تۆمار کردووە (هەیکەر– تەیکەر– پەیکەر) کە خۆی لە خۆیدا، مانایەکی بەرز و (کورسی)یەکی دارساج و (مێز)ێکی لووس و پانوپۆڕ دەدەنە (کەر). تۆ ئیقاعی هەر سێ کەرەکە (کەر کەر کەر) کۆ بکەرەوە و بەشێنەیی و بەخێرایی، پەنجا جار بیڵێوە، بزانە چ جۆرە ئیقاعێك و هارمۆنیایەکی

کەرانەی لێ دەر دەچێ و زمانیشت تەتڵەوپەتڵە دەکات و کەللەت کاس، وەك بڵێی لە زەرینێکی بەزایەڵەی (هارمۆنی) بکات وایە.

* (هەوراز و لێژ): سەیری ئەم دیمەنە جوانە بکە، بەدووربین یا بەچاوی ئەبڵەقەوە، کەرێك بەبار بێ یا بێ بار بێ، لە شاخ هەڵتر هەڵتر دادەبەزێ، کەرێکیش بەسرکی بەچیا هەڵدەشاخێ. سەیری هەردوو جووڵانەوەکە بکە، بزانە چۆن چاوت ڕێشکەوپێشکە دەکات و دوور نییە تووشی ئیستکماتیزمیش بیت. لام وایە هەر ئەمەیە (قانوونی حەرەکە) لە شیعردا کە بەلێوەشاوەییەوە (نالی)ی نەمر بۆ کەرە زیندووەکەی بەکاری هێناوە.
* (سینەپان): بۆ (جوانی) کورد حەزی لە ژنی سینە پان و تەبەشە، (نالی)یش ئەو سیفەتە ژنانەیەی بەخشیوەتە کەرەکەی خۆی و نەیبەخشیوەتە مەستوورەخاتوون.
* (مووچەکورت و شانەبەرز): هەمدیس دوو سیفەتی جوانیی ژنن یا (حەبیبە)ن و بۆ شەوانی سوور و درێژ، قیمەتی تەواو نابێت.
* (گوێدرێژ): ئەم جۆرە هەیکەلە شۆخ و شیرینەش، دەبێ گوێچکەیەکی جوانکەڵەشی هەبێ، خۆگەر بیوتایە (گوێکورت) تابلۆی کەرەکەی، بەتەواوی دەشێوا و گوێچکەکەی دیار نەدەدا، سەرەڕای ئەوەش، گوێی درێژ، وەك (ڕادار) و (لاقیتەی حوبەیبی و تلستار وایە و زۆرتر قسەی (قۆڕ) هەڵدەمژێ و زۆرتر لە جرتوفرتی (ئاژانسەکان) حاڵی دەبێت.
* (بنزگ و جەبهەت سپی): سەیر کە چۆن سەرکەوتووانە و هونەرمەندانە، بەفڵچەکەی، تۆنی ئەم ڕەنگانە بەسەر کەرەکەی بەش دەکات. تۆنی ڕەنگی سپی بۆ بن زگ و تێوڵی، تۆنی ڕەشیش بۆ ناوگەڵی. بەمەش جۆرە (صراع)ێکی درامی لە نێوان (ڕەش و سپی)دا دەخوڵقێنێ و مەسەلەی (خێر و شەڕ) و (ڕاستڕەو و ناڕاستڕەو) دەخاتە ڕوو. هەر بەوەندەش ناوەستی و بۆ ئەوەی ئەم (صراعە) لەم تابلۆیەدا، بەجوانی بەئەنجام

بگەیەنێ. ئەو ڕەش و سپییەش، بەتەواوی جێی خۆی پێ بگرێ، سیفەتی (غارکەر) و ڕەهوانی و لەش سووکیی (وەرزش)انە و نەوڕەسیدەیی و توند و تۆڵی و تێکسمڕاویی پێ دەبەخشێت (یەککەتاز و سێبڕ و دووباد و شەشدانگ و درێژ) واتە: هەر بەڕەمز (خێر) بەسەر (شەڕ)دا زاڵ دەکا.

* (کەللە وەك جەرەی شەراب): تۆ هەر ئەوە بێنە بەرچاوت، ئەو کەرەی (نالی) کەللەی ببێ بەجەرەی کۆنەشەرابی حەوساڵە و تۆش پێك دوای پێك نۆش بکەیت. جا وەرە (پڕ نەشات و تەردەماغ) نەبیت، بەڵام من لام وایە، خەڵك لەم جۆرە جەرە شەڕاب یا عارەقی کەسکوون و بیرەد وێسکی دمپڵ و کۆکتێل بکات و بیخواتەوە، زیاتر سیامەست دەبێت، نەخوازەڵا ئەگەر دنیاش پیرەبەهار بێت و لەتەك کچانی (زانکۆ) لە سەیران بێت. لام وایە دەشزانن لەبەرچی؟!

* (مل عەلەم، شیرن قەلەم، ئاهووشکەم، مەیموون قەدەم): تۆ وەرە و بەپەلە، دوو (لـەم) و (دەم)ێك کـۆ بـکـەرەوە و بـیـلـێرەوە (لـەمـلـەم دەم دەم)، ئاماژەیەکی سەرسڕمانیشە بۆ دەم و قەپۆزی کەر، ئینجا دەزانی چ جۆرە زمانێکی کەرانە بۆ کەشوهەوای بەیتە شیعرەکە خوڵقاندووە. ئەمە و تەماشای ملی بکە، وەك ئاڵا وایە و درێژە و ئافرەتی ملدرێژیش کورد زۆر حەزی لێ دەکا (دوور نییە دروشمی نالی ئاڵای ملی کەرێك بووبێت) یا بەواتاکەی تر، دەکا (ملی حەبیبە). ئینجا وەرە، سەیری (شیرن قەڵەم) بکە و بزانە چۆن و جارێ بۆ (شیرین) شێوەیی ئەو کەرە و جارێ بۆ جۆری دەست و پێنووس و ئوسلووبی ئەدیبانەی ئەو کەرە، چۆن (نالی) ئەو سیفەتەی پێ داوە، وا دیارە، نەوەڵڵا هەرواشە، (نالی) سیفەتێکی ڕۆشنبیرانە و ئەدەبیانەشی مەبەست بووبێ بۆ کەرە ڕۆحشیرینەکەی، کەرە ئەدیب و ڕۆشنبیرەکەی. من وای بۆ دەچم، کەچی کاکە حەمە دەڵێ: مەبەستی (نالی) لەم وێنەشیعرییەدا، پەل قشت و خشت و خۆشڕەفتیی

کەرەکەیە و (چونکە دیارە لە جیهانی کەران شاعیر و ئەدیب و نووسەر هەڵنـاکـەوێ). نـەء، سەد جـار نـەء. کـاکـە حـەمـە گـیـان، بـەقـوربـانت بم، چـاوەکـەم، بـەسـەری کـەری نـالـی، لـە (جـیـهـانـی سێیـەم و چـوارەمـی هونەرمەند و شاعیر و ئەدیب و نووسەراندا، کەری زۆر چاك و بارەبەر هەڵدەکەوێ، کە شان لە شانی کورتانی کەرەکەی (نالی)یش بدات. ئەی وا نییە.

* (ئـاهـوو شکـەم و مـەیموون قـەدەم): لـێرەدا کـەرەکـەی بـەئـاهـووی چین دەشوبهێنێ، کە سرکترین و ڕەسەنترین ئاسکێکە، وەك بڵێی: ئەو مەیموون قەدەمە، یا ئەو پێ بەخێرە، بەتایبەتی لەو سەردەمەی کە (گومرگ و باج و ترانزێت) نەبوو، بارگە و بنەی زێڕ و جەواهێراتی وڵاتی چین و ماچینی پێ بۆ کوردستانەکەی بابانیانی بهێنێ، ئاوا بەم چەشنە،. (نالی) لە (منفعەی متبادلە)ی نێو دەوڵەتان تێ دەگا و دەشزانێ تەنیا (مصالح) دەور دەگێڕێ و ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفە و مەبدەئەکانیش بۆ نێو توونی بابا...

* (سمخڕ): هەموو دەزانین کە پیاوی شەرقی و بەتایبەتیش کوردەکەی ئێمە، حەزی لە شتی (خڕە)، جا ئەو شتە هەر شتێ بێت. بۆیە هاتووە وەك (ڕمزومرموز) ئەو سیفەتە بەتامەی، سمخڕی بەخشیوەتە کەرە (نازدار) و (نازەنین) و (نیان) و (شیرین)ەکەی... ئەو کەرەی کە کلکی هێسترانەیە. واتە: کلکی شۆڕ نییە و بڕە. کڵکی شۆڕیش بۆ (شت) دەس نادات و باش نییە و بەربەستە. لە هەمان کاتیشا قۆناغ دەبڕێ و ماندوو نابێت و هەزار جاریش (ئەملا و ئەولای) پێ بکەیت و یانیش (سواری) بیت شەکەت و (یاخی) نابێت و (ئارەق نارێژێ) و کارەکەی پێ خۆشە.

بەڵام هەر لێرەدا هەڵوەستەیەکی کەرانە دەکەم و تۆزی دەسڵەمێمەوە لەوەی کە ئەم (بەستەزمانە) تووشی (ماسۆشیزم) هاتبێ و حەزی لە

ئـازارکـێشەکـان بـێت. دەك لـەبـەرت مـرم سمـخـڕ، وتم (سمـخـڕ)ی بـۆ مەسەلەیەکی سێکسی بەکارهێناوە. ئەوەتانێ دەڵێ (سم وەکو یەشم) واتە: وەك عەقیقی سوور و زەبەرجەد. لە (پەشمی تووکی پێدا سەرنگوون)یش ئـیشارەتـە، بـۆ شوێـنێکی بـەرجـەستـەی ئـەو گوێدرێژە مـاکـەرە، بـەڵگـەش: (زەرق و زەرق و بەرق و بەراقی شین و پیرۆزەیی و بێ قرێژ) و (چاو وەکو بـیـجـادە و عـەقـیـق و کـارەبـا و یـاقـووتـی سوور، یـا دوو شەوچـراغـی شوعلەرێژ)ن، کە بێ دڵاودڵی و بەوەکات، زیاتر لە سیفەتە هـەرە جوان و نەرم و گەرم و نیانەکانی (حەبیبە و مەستوورە) وەرگیراون. لاشم وایە ئەو گوێدرێژە، نێرەکەر بووایە (نالی) ئەم هەموو زیرەکی و سنعەتکاری و جوانبـازییەی تێدا خەرج نەدەکرد و سەریش نەدەکەوت. چ بڵێم، (نـالی)، بەحرێکە بۆ خۆی.

بـابـە (نـالی): هـەرچـەندە و زۆر بەسرکی و جوانی (مەستوورە)ی کردووە بە، "ربی کما خلقتنی"ی ناو حەمام، بەڵام کەرەکەی خۆی داپۆشیوە. کاتێ کە دەفەرمێ (گوێدرێژی بار و کوتان بەرز و پالانی بەزێن)، کە لام وایە مـامۆستا وەك مەلایەکی (١٢) عیلم، مەبەستی ئیشارەتێکە بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزە کە دەڵێ (.......... والحمیر لترکبوها وزینە) ... بەڵام زۆر دەیبڕێتەوە، ئەگینا زۆر خشڵی جوانتری لەبەر دەکرد و دەیکردە، بە(سهیر زکی) یا (لیلی علوی) و (مارلین مۆنرۆ) و یا (بریکیت باردۆ) یەك.

* (قـانیعی بـابی ڕەزا): وەك ئـاشکرایە. ئەم مـاکـەرە، هـەم قـانیعە و هـەم ڕەزا. (والقـنـاعـە کنز لایفـنـی)... بڕوایش بـەئـایـەتـی (فـاصبـر صبـرا جـمـیلا) و پـەنـدی (الـصبـر مـفـتـاح الـفـرج) هـەیـە، بـۆیـە دەڵـێ: (سالیکی سەبر و تەحەموول، بوردەبار و هیچ نەوێژ) تا بەتەواوی بەم بەڵگەیە، پشتیوانی لە هـەڵوێستی خۆی و کەرەکەی بکات. نەختێکیشی پێ ناچێ، هـەر ئەو کەرە کە جارێ بە (ئەدەب و شاعیر و ڕۆشنبیر) ناوی دەبرد، ئەمجارەیان

بە(دیندار)ێکی بێ خەوش و فرۆفێڵ لە قەڵەمی دەدا. بەڵام بەش بەحاڵی کەرانەی خۆم، تۆزێ لە (صائم الدهر) و (قائم الليل) دوو دڵم، کە ئایا دەبێ، سەرەڕای ئەو سیفاتانەی بەخشییە کەرەکەی، ئەمەیان دوو ڕەمزی جنسی نەبن. یانی: گەر بەدیوی ئەودیو و ئەودیوەش. سەیری بکەین کە (صائم) واتە: بەڕۆژوو و هیچ ناکات و (قائم)یش واتە: بەشەو زەوقی هەڵدەستێ. چی بڵێم، وەك وتم، نالی بەحرێکە و بنی نییە. نەك ئەمە و بەس، بگرە لە ئاخر و ئۆخردا، دێ و سیفەتی (فیکر و عەقڵ و فەلسەفە و ئەکادیمیا)یشی پێ دەبەخشێ و دەیکا بە(کەرێکی عاقڵ)، عاقڵێ بوو ناوی کەر بوو، بەڵام کەرە عاقڵێکی ڕەوشتبەرزە و بەدڕەوشت و بەدکردار و بەدزمان و بەد کورتان نییە و بڕوای بە(ئەتیمۆلۆجیا)یە. واتە: هەم عاقڵە و هەم بەڕەوشتە، کە بێگومان هەموو کەس ئەم خاسیەتە، بۆ خۆی و براکەی دەخوازێت، هەروەك چۆن ئەم کەرە (ڕۆشنبیر و شاعیر و دیندار و پڕ لە مەعریفە)تە هەیەتی. دە گۆڕ هەڵتەکێنە مام (داروین). دە کورتانت فڕێدە خاڵە (ئانیشتاین).

لە ئەنجامیشدا بابە (نالی) دەپرینگێتەوە و هەڵوەستەیەکی یەجگار بەرز وەردەگرێت و بەبێ ئۆقرە دەڵێ:

چەندە پێم خۆش بوو زمانی حاڵی دەیوت (نالیا)

هەردوو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ.

* بەڵێ (زمانی حاڵی نالی) زمانی دڵە، زمانی شەیدایانی ڕێگەی (ڕاستی و حەقیقەتە)، (دڵ و زمان)یان یەکە ئەوەی لەناو دڵیاندایە لەسەر زمانیاندایە، بۆیە سیفەتێکی (سۆفیانە)ی بەجۆش و خرۆش و حاڵگرتووش دەداتە کەرەکەی و دەیهێنێتە (قسە) و ناوی خۆیشی، دەخاتە سەرزمانی (درێژ) و (کاوێژکەر)ی ئەو کەرە و بەرز، بەرز بەرز، درێژ درێژیشی دەکات (نالیا، نالیا، نالیا.) و لەنێو ئەو ئیقاعە سامدارەدا،

گوێچکەی بچووکمان پڕ دەکات لە (سۆز و ئاواز). بەڵام چی دەڵێ؟ یا چی بە(نالی)یش بەئێمەی بێژێ و (تەرجەمەیەکی فەوری) .زمانی شیرینی ئەو کەرەمان بۆ دەکات.

(هەردوو حەیوانین)، هەی حەیوانی کوڕی حەیوان، یەکێکمان (گوێ کورت) و ئەوەی تر (گوێ درێژ). یەکێکمان (ناطق) و ئەوی تر (ناهق) یەکێکیان (دەزەڕێ) و یەکەکەی دی (خیتاب دەخوێنێتەوە). لە نێوان (ناطق و ناهق) و (زەڕین و خیتاب)یشدا هاوتەریبی و جۆرە جیناسێك و تەشبیهێکی بەلاغی هەیە. دەشبێ وا بێ، چونکە ئەو هەموو سیفەتە ئەخلاقییە بەرز و جوانانەی، کە (نالی) بەو (کەرەی) داوە، بڕوا ناکەم لە زۆر (ئینسانی) ئەمڕۆدا هەبێت و مابێت. کەرێکی ڕۆشنبیر و شاعیر و ئەدیب و دیندار و عاقڵ و سۆفیگەر و بێوەی. وەی وەی.

سەرنج: لە ژمارەی داهاتوودا، لە تەك (ماکەر)ی شاعیرێکی تر، دەکەوینە هەلەکەسەمای هەڵسەنگاندن. چاوەنۆڕ مەبن.

## ئازیزەکان، ملقوت و گوێدرێژەکان

هەموو بنی مانگێك، لە کەرژمێری (٣٥٦)ی ئەوپەڕی نیوەڕۆدا، بەزەڕین و جووتەیەکی ئایدیۆڵۆ، لۆژ، لۆژ، ی... بەرنامەیەکی قووڵ و بەتام و کام و هەمەڕەنگە و بۆ ماوەی (٣٥٠) چرکەکەرتان بۆ پەرش و بڵاو دەکا. ئەویش لەسەر شەپۆڵێکی هاروهاجی وا، کە درێژییەکەی نیوملیم و شەپۆلێکی کورتیش لە (٢٤،٩) کیرۆمەتری کەرانەیە و قورساییەکەشی بەقەد قورسایی سەرشانی (کوردەها) و گەورەترین کورتانی پینەکراوی ئەم چاخی ئیڤڵ و فێستڤاڵی لاوانی نایلۆنی سەرگەرمی، کەفەڵئاوساوی دنیایە.

گوێدرێژکردنتان بۆ ئێمە، مایەی هەزاران جووتەی ئافەرین و سوپاسنامە و ڕێزلێنان و خەڵاتە.

هەواڵەکان زۆر بەکورتی:

* ڕۆژی نۆشەمەی ڕابردوو، هەر دوای ڤەراڤین بەچوار دەقیقە، سەرۆکی کەرەبەفرینەکان، بەسەردانێکی نیمچە ڕەسمی چووەتە وڵاتە یەکگرتووەکانی (قوزکەپران)، نزیکەی دوو ڕۆژ و سێ شەو و نیوی سوور دەخایەنێ و پەیمانی ئاڵوگۆڕکردنی فەریکترین (قـ..) و گەلۆرترین باڵیۆز و (٥٠٠) تەن مۆز، مۆر دەکات.
* ڕۆژی نیوشەمەی چەشتەنگاوی پێنجشەمەی بەسەرچوو، ئاگرێکی بێ ئامان، بەربووەتە کورتانێکی ئارایشتدراو، هەرچی ترومپا درێژ و لوولەکانی ئاگرکوژێنەوە هەبووە، دەوریان لێ داوە و پێی دەحەپن، کەچی تا ئێستا و تا ئامادەکردنی ئەم دەنگوباسە زوڵاڵە، (نێرگەی) ئاگرەکە، تا دێ ڕەپتر و زلتر دەبێتەوە و نەکوژاوەتەوە. جا بۆ؟
* ئا. ئەمڕۆ وەفدێکی کەرکەتتا، سەری لە قەڵا شیتاڵ شیتاڵبووەکەی ئەم

شاره کۆن و ڕزیوەی داوە و بەناو کۆڵانە تاریك و ڤایرۆساوییەکان و بەعەرەبانەیەکی شلوشۆق و کەرکێش، لۆژەلۆژی کردووە و زۆر گەڕاوە و (مـانـدی) بـووە و ڤـایـرۆساتـی گـەلـەك نـەخـۆش (اخـلاقـی و جـنسی و اقتصادی) دۆزیوەتەوە و خوا و پێغەمبەر یار بێ، ئەشێ تۆژێنیێ. ئەمیش هەر هەمووی لە ماوەی (٣) سانیەی ڕەق و ڕەبەقا.

* دوێنێ پاش ئێوارە و لە دوای تەواوبوونی کۆڕی (مامۆستا،) چاوسوورە جەربەزە و جەزرەبەدراوەکانی قەمچۆغە، توانیویانە خۆیان بگەیەننە نێو گـونـدی (مـحـرمـە)ی وێرانـکـراوی (کـەرنجان) و دوو مـریشکـەکرە و کەڵەشێرێکی خەساوی ئامیرلیوا و قازێکی داخدار و لاقشکاوی کۆنە ئـامـیـرسریـە و دوو کـاتـیـبـی (مستشاری) بـێ مـانـەند، بەدیل بگرن و عەڵەشیشێکی بێ ئابڕووش بەهێسك و پڕووسکەوە هەڵقۆڕێنن. نۆشیان بـێ. کـەچـی لـە ئـەنجام و دەرئـەنجامـی و دوائـەنجامـدا، سەرۆکـی مریشکەکرە، بڕووسکەیەکی بۆ سەرۆك داك نۆشووکەرەی میللەتانی (بێ سەروپـێ) لـێ داوە و تـێـدا داوای کـۆبـوونـەوەی شەپـقـەلـەسەر و پاپیلەدەمەکانی میللەتە (ئاشتیخواز) و (حەقمچییەکان) یان کردووە و تاکو بەزووترین (کات) چارەسەری ملهوڕانەی ئەم کارە ناڕەوایە بکەن و بـەر لـەوەی مـیـلـلـەتـی مـریشکـەکرەی دەسبـەزەبـر و تـونـد و تـەڕە، دەس بوەشێنێ. کارە ناڕەوایەکانی ئەم جیهانە تینگاوتینگە داپڵۆسێنێ و بەر لە خۆی، دایکی خۆی و کەسانی تر، لەسەر بەرماڵی عیسا و بۆزا و کۆنفوشیوس بگێت، بگێت، بگێت.

* ماکەرێکی شەش خانەی بزمارڕێژکراوی عەنتیکە و مەنتیکە، لەم بنارەدا، ون بووە و کەس ناوی خۆی و ئابا و ئەژدادی نازانێ، تەنیا ئەوە نەبێ، کـە کـۆرسیـیـەکـی پـڕلـۆنـی لـەبـەردایـە و تـەمـەنـی (٦٠–٧٠) ساڵـە و ئیسکەرپینی ئادیالۆجی لەبەردایە و چاویلکەیەکی، زۆر ڕەشی لەچاودایە و ڕۆژنـامـەی (جـیـهـانـی ئـەمـڕۆ)ش دەخـوێنـێتـەوە و (چـاوچـاوانـێ و

هزرهزرانیٚ) و فشەش بەم و بەو دەکات، هەر کەسیٚ گومانی لیٚ کرد و دۆزییەوە، با بەپەلە، ڕای مالٚیتە مزگەوتی گەورەی ناو بازێر. مۆنیکایەکی گەورە، چاوەنۆڕیەتی. "لەچاوەڕوانی مۆنیکا گەورەدا" ببوورە پێکێت گیان.

* ئەمڕۆ یەکێك لە (جاش وەزیرەکان)ی ئەنتی کەرایەتی، دوای ئەوەی پەنای بردووەتە بەر گوندی (کەردز)ی سەر بەشاری هیچەوە، سوێندی خواردووە ئیتر (کوردایەتی) بکات و واز لەم ترلەیلێیە بهێنی. بەخێر بێتەوە نەورۆز و بەهار.

* دەشەممەی ڕابردوو، شەمە بەکەم کەس، شاعیرێکی چەقاوەسوو، لە کۆڕێکدا وتی:

**سمتی ئێوە**
**سەکۆیەکی گاورگرە**
**بەدرێلی ئەوەی ئێمە، ناپەلەقیٚ**
**(قـ.) ئێوە**
**مەشکەیەکی بزنەوەسە و**
**بەدۆژەنگی کێری ئێمە، ناشڵەقیٚ**

کەچی شاعیرێکی لەم چەقاوەسووتر هەڵدایە و گوتی:

**کچ بوومایە حەوت شووم دەکرد**
**خوا ڕەحمی کرد**
**کچ بوومایە، تەماعی کورسیی تەشریعی و**
**دوو تەنفیزی و (گـ.) دەکرد**
**لەوانە بوو، خوا پێم نەگریٚ**
**حەبەکەشم پیٚ قووت بدا و**
**شافەکەشم پیٚ هەڵگریٚ.**

شاعیرێکی حەقگۆش دەنرکێنێ:

**ئـــەوی لای دا لـــەڕێ لـــێم لا نـــەداوە**
**کـە زانـیـم هـیـچ و پـووچ و نـاپـیـاوە**
**بـەکوسکێشی گـەیشـتـووەتە مەبەستی**
**کـە نـامـەردە و بـەمـەردی نـاوی داوە**

* ئەئاوا، حەوت شەمەی ڕۆیشتوو، یەکێك لە جەنگاوەرە شەل و کوێر و لاڵ و سەقـەتـەکـانـی سیسرکـە تـوانـیـویـەتـی، خـۆی بـگـەیـەنێتـە نێو سوپـای سربووی قـاڵۆچە و دەبابەیەك و دوو ڕۆکێت قووت بدات و، بۆ مـاوەی (٤٩،٥) لـەگـەڵ پـۆسـتـاڵشڕ و قـەیـتـانشلـەکـان شەڕە هـێلکـە بـکـات، بـەڵام، ئۆخەی لە ئاخروئۆخردا، کە هێلکەی پیسی پێ نەماوە ئینجا بەتەماتەی بڵ، کە ئەویش پێ نەماوە بەدیل گیراوە و دەشڵێن: خۆڵ و دۆی بەسەر خۆی و خەڵکی بێگوناهیشدا کردوە و بۆ (قەسابخانە)ی ڕێژیم حەواڵە کراوە.

ئازیزەکان:

ئەمە کورتەی هەواڵەکان بوو.. هیواداریـن کە گوێی ڕەپتان (شل) نەبوو بێت.

گەلەك سوپاس.

## ″مـارشێك بـەزەڕینی کەر و مـاکەرێك″

بۆ ئاگاداری: لەم ڕۆژانەدا، لەنێو کەشەوهەوایەکی (دیموکەرایەتییانەدا) دەستـەیـەك هـونـەرمـەنـدی (پـەرکـەمگـرتـوو) کـۆبـوونـەوەیـەکی بـەرفراوانیـان کردووە، بـۆ لـێتـوژیـنـەوە لـە دەرکـردنـی فـیـلـمـێکـی (ڤـیـدیۆ) بەنـاوی (زەڕینی مێژوو) کە تیایا ئێش و ئازاری ئەم گەلە نەبەردە لە ماوەی ئەم (١٠٠) ساڵـەی دوایـیـیـەدا، ڕەنگ دەداتـەوە و لـەبـەر نـەبـوونـی (کـەرەدەرهـێـنـەر)ێکـی (لـێ)هـاتـوو، نـیـاز وایـە پـێوەنـدیـی بـەدەرهـێنـەری هـیـنـدسـتـانـی (شڕی تش کەرەفاتی راجا جۆلاکەر) بکرێت، کە قورگی بەکێری کەر سمڕاوە.

بۆ ئاگادارییەکی تر: ئێزگەکەمان، نیازی وایە سروودێکی هەمیشەییی خۆی هەبێ، تا پێی بناسرێتەوە، بۆیە داوا لە (ئاوازدانەرە) دز و بالاکورتەکان دەکەین، ئەم (دەمەتەقێ)یەمان بۆ بئاوازێنن، هەر (ئاوازکەر)ێکیش تیایدا سەرکەوتوبوو، خەلاتەکەی شریتە دەنگێکە کە بە(نۆتە) زەڕینی ماکەرێکی تێدا تۆمار کراوە، ئەمەش دەقەکەیە:

**چل کەر، چل جل چل جەوەندە**

**کوا کەر، کوا جل، کوا جەوەندە؟**

**ئەمە کەر، ئەوە جل، ئەوە جەوەندە**

**کەر، جل، کەر، جل**

**کەر جل، کەر جل، کەر جل، کەر جل، جل کەر، جل کەر، جل کەر.**

گوێ گرانە خۆشەویستەکان:

هەر ئێستا بە (کەرتەرنیت) ئەم هەواڵە سەرسوڕهێنەمان پێ گەیشت:

"باوەڕپێنەکراوێکی سیاسی ڕای گەیاندووە. کە ئەمڕۆ سەعات (٤)ی نیوەشەو و دوای تەواوبوونی ئاهەنگی کۆکتێل، وەفدەکەی (برایانی...) لەتەك بەچکە بەرازەکانی نەوەی هۆلاکۆ و هیتلەری مامۆستای، هەمدیس و دوای پچڕانی ڕەشمەی مفاوەزات دەس پێ دەکەنەوە وا زانراویشە، نابێ مەسەلەی (ئۆ... تۆ... نۆ... مێ) لەو دانیشتنەدا باس بکرێ، چونکە هەر هەموومان براین و (برایەتی و کەرایەتی) دروشممانە. دەشڵێن هەندێ لە ئەندامانی وەفدەکە، لەم بڕیارە سڵەمینەتەوە و بڕوایان بەو دروشمە نییە.

## چەند جووتەیەکی گەرم

هەر لەبەر هەندێ (کێشە و مێشە)ی (ڕەخنە و مەخنە) و (ئایدیۆلوجیا و مایدیۆلۆجیا) و گرفت و مرفتی (فیکر و میکر) و (ئەدەب و مەدەب) و (ئەبستم و مەبەستم) و (هونەر و مونەر) و بەم دواییە (عەنتیکە و مەنتیکە)ی کوڕی پەشتەماڵ بەگ ئەم (بانگەواز)ە پڕ لە جووتەیەی بڵاوکردەوە، کە ئەمەیان تەنیا بەشێکیەتی، ئەمیش لە پێناوی (کەرەپێدان) و (کەراژۆکردنی) گیان و مان و هەست و نەست و سۆز و مۆزی (کەریزم) و لە پێناوی یەکاڵاکردنی کورتانەکانی (کەریۆلۆجیا) لەگەڵ سەرجەمی یاسا و ڕێژیم و سیستەم و تیوری و پێڕەو و پڕۆگرامی (ناوەوە و دەرەوە) و پڕۆژە ژەنگاوییەکانی سەرلەبەری ئەنجوومەن و ڕێکخراو و سەنتەر و دەستە و تاقم و گرووپ و کۆمەڵە و یەکیەتی و سەندیکا و سەندیکەکانی جیهانیشدا، کە خۆی لە خۆیدا (اختیارێکی قورس)ە. لێرەدا هەندێ سروود و بەند و برگە و (مفاهیم)ی ئاشکرا و زەقەکانی، نەك شاراوە و پەنگخواردووەکانی. ئەو بانگەوازە دەخەینە بەردەم مێشکی کاسبووتان، گوێچکەی لەق و لۆقتان:

* پێویستە خوو و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و خەمۆ خەونەکانی (کەر) لە هینەکانی مرۆڤە بەراز ڕەفتار و (پتی کەرە کان) نەکا بەوردیش قسە: (بێ هێژی و بێ بێژی و بێ چێژی و بێ وێژێ.!)
* پێویستە لە ڕەچەڵەك و چایەرە ڕەسەنی خۆی دانەبڕێ و هەر (حەمتڕ) و کەر و کەرئەژداد بمێنێتەوە.
* دەبێ و پێویستە، زۆریش پێویست، واز لە ماکەرمەلەیی و هەڵمەتەکاسەیی و شەرەزرتانێ و کلك پێوەکردن و چەقۆهەڵسوون و تەڵەدانان و مەچەکبادان و چارچیقەی شاف پێ هەڵگرتن و شوان خەڵەتێنەیی و قاو

و قووچ بهێنێ و سەگوسواڵی و جادووبازی و پیلانگێڕان و لاپوازی و ڕووتاندن و چەوساندن بخاتە لاوە و ئەوەندەش خۆشباوەڕ و گوێ لەمست نەبێ و نافەکی کچە هەژار و لێقەوماوان نەلووکێنێ.

* دەس لە هەڵتیزانی ناوەخت و لە شات و شووت و قەڵەمباز و شڕمبڕمی ئایدیۆلۆجی هەڵگرێ و خۆی لە شتی لەترقەمچەڵ پێچ نەدا و ئەوەندەش چەنەچەن نەکات و لا جڵەویش نەبێ.
* بەهیچ کلۆجێ بڕوای بەتیوریی (ق...)سووتەکێ و (ک...)ەپرتەکێ و قنگەخلیسکێ نەبێ و قەرسیل و کورتان و ناڵ و بزمار و زەڕین دروشمی بێ و لەقەی کوشندەش لە تیرۆریست و پتی کەرایەتی بدات.
* سەڵەوات لە دیداری دۆگما و دۆگماتیزم نەدات و هاوپەیمان و هاوڕاز و هاوباسی کەرانی وەك خۆی بێ.
* کەس نەکوژێ و نانی کەسیش نەبڕێ و سم و نالی کەسیش نەشکێنێ و جۆرکی کەسیش نەفڕێنێ.
* دەبێ لە هەڵپە و شڵپە و هەڵبەز و دابەز و (وێسکیی دیپلۆماسی) دوور کەوێتەوە. تڕ ها ها ها، تڕ ها ها ها.
* وەك ئادەمیزادی گوێکورت و ئارەزووهار، ئاخوڕبەرز و تڕزڵ نەبێ و ئەوەندەش بەماڵ و قەسر و قەمارە و عیمارە و خانمەکەی نەخوڕێ.
* دڵڕەشی، درۆ و بوختانی شاخدار و شەڕەقۆچ نەزانێ، چون لە کیشوەری کەراندا، چ میر هەیە چ وەزیر و چ گزیر و چ ئەسیر هەموویان لە (حقوق و واجبات) دا هاوکورتان و (یەکسانن)، بژی (یەکسانی).
* دەبێ، نەخاسمە (ماکەرەکان) لە جیهانی ڕووکەش و بێتام و زەوەری هەوریشم و پڕلۆن و تڕلین و نینۆ و ئیسفەنج و ئەنگۆرە و بازە و نایلۆن و دیۆلین و پلیسێ و پۆپلین و پیکە و چۆخ و سەرج و جەرسە، دوور

کەونەوە و ڕوو لە خۆڕسکی بێگەرد و پاك بکەن.

* بەتوندی نەفرەت لە تیۆریی ڕەگەزپەرستی و کۆسمۆکەرایەتی و گەمەی گەلان و پڕۆتۆکۆلاتی ڕەش، بکەن.
* تف و بەلغەم و نەفرەت، لە تانکۆتۆپ و بازوکە و نارنجۆك و بۆمبا و ساڕۆخ و فرۆکەی هەنتەر و مێگ و کۆنکۆرد و میراژ و چەکی ئەتۆمی و پۆدرەی کیمیاوی و گوژانك و دەمانچەی ناوقەد بکەن، ئاشتیخوازێکی گوێقوت بن و باری مەسئوولیەتی قورس هەڵگرن.
* واز لە تیۆریی قومقومۆکانە و زورناژەنین و دەمبەڵەك لێدان بهێنن و نابێ سم یا (کـ..)ی یا (قـ..)ی لەدەر بێ، چونکە، دەمڕاستی، بڕواپتەوی، پاکی و خاکی، بڕبڕەی پشتی ڕۆژانەی کەرە.
* دەبێ دژی هەموو جۆرە (بیروکەرایەتی) و (دیکتاتۆریەتێك) بن، دیکتاتۆریەتی: فیکر، ڕەوشت، ڕامیاری، دان، گان، دان و گان، بیروڕا و دیالۆگ بێ. دۆستایەتی، خزمایەتی، ناوچەگەریەتی، کۆلانچیەتی، عەشیرەتچیەتی، گرووپچیەتی، کاری تێ نەکا، بەغەیری کەرایەتی. بەهەردوو چاوە ئەبڵەقەکانیشی سەیری (ڕاستی و ناڕاستی) یەکانی (حەرەکەی تاریخ) و (مەئریخ) و بەهار و ژیان بکات. ناشبێ دوای تەمەنێکی درێژی خەبات و تێکۆشان، بەربانگ بە(قەرسەقوڵ) بکات.

جا بۆ نا، گەر زانیمان بەم دواییە بە(مختبر) ئیسپات کراوە کە (کەر) زۆر لە ئەسپ زیرەکترە و زۆرجاریش، لە (خطوطی جبهە)ی براکوژیدا، بۆ عەمەلیاتی زۆر (گرنگ گرنگ) بەکار دەهێنری. گەر بڕوا ناکەی، پەلە مەکە گوێ شل کە:

"جارێکیان مرۆڤێك و کەرێك، ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، مرۆڤەکە، وەك لێی بووە بەعادەت و خوو، ویستی کەرەکە، هەرەسان بکا و ئەم قەوچەقەوچە لە نێوانیان ڕووی دا:

مرۆڤەکە: تۆ دەزەڕی.

کەرەکە: تۆش تڕزلی.

مرۆڤەکە: تۆ لە نێو پیسایی دەخەوی.

کەرەکە: تۆش لە باوەشی زوڵم و زۆرداری دەخەوی.

مرۆڤەکە: تۆ، جۆ دەخۆیت.

کەرەکە: تۆش، ئاوەجۆ.

مرۆڤەکە: گژوگیا هەڵدەلووشی.

کەرەکە: تۆش، باڵندە و فڕندە و مریشك و قەل و پەز و کەروێشك و کەو و کەڵەکێوی هەڵدەلووشی.

مرۆڤەکە: تۆ، زۆر گوێچکەت درێژە.

کەرەکە: بەداخەوە، تۆش دەستت زۆر (درێژە).

مرۆڤەکە: تۆ بەخاڵۆی ئەسپت دەخوڕی.

کەرەکە: تۆش بەئەسپی خاڵۆت شانازی دەکەیت.

مرۆڤەکە: تۆ سەرتاپای ڕۆژ جڵەوت لە دەمە.

کەرەکە: تۆش سەرتاپای ڕۆژ، ڕاوڕووتت لەبەردەمە.

مرۆڤەکە: تۆ بەسمەکانت جووتە دەوەشێنی.

کەرەکە: تۆش بەزمان و دڵ و چاو لووشکە دەهاوێژی.

مرۆڤەکە: تۆ بەوەستاوی دەنووی.

کەرەکە: تۆش بەخەوتوویی دەوەستی.

مرۆڤەکە: تۆ دزی لە کێڵگەی خەڵك دەکەی.

کەرەکە: تۆش، دزی لە کێڵگە و خاوەنەکەی دەکەی.

مرۆڤەکە: تۆ بەلەشم و لوشمی.

کەرەکە: تۆش، بەکەشوفشی.

مرۆڤەکە: تۆ سەرت ڕەقە.

کەرەکە: تۆش، دڵت ڕەقە.

مرۆڤەکە: تۆ سەری قەرسەقوڵی خۆت دەکەیت.

کەرەکە: تۆش، سەری عەرز و نامووسی برادەرانت.

مرۆڤەکە: تۆ ڕەشمەت لە ملە.

کەرەکە: تۆش، بۆینباغ.

مرۆڤەکە: تۆ کەری.

کەرەکە: تۆش، ئادەمیزادی.

ئا ئەوەتانێ هەموو کۆنە پێغەمبەر و هزرداران، داوایان لە (ئینسان) کردووە، کۆشش بکا و لە شت بکۆڵێتەوە و (کۆڵ نەدا). دە هەر بزانن، قەت کەر (کۆڵ دەدا). هەر بۆیەشە کێلەبەردەکەی حامووڕابی (کەر)ی فەرامۆش نەکردووە و لە ئاستێکی (ئەکادیمیا)دا باسی دەکا. هەر بۆیەشە، نابێ کەس بە(ترِی کەر) پێ بکەنێ، نەوەك ددانەکانی ئاڵ بێت. گوایە دەڵێن: هەموو گۆڕانیبێژێك، ناتوانێ (چینەکان)ی دەنگی خۆی بگۆڕێ، کەچی (کەر) لەسەر یەك (چین)، وا دیارە بڕوای بە (ململانێی چینایەتی) زۆر پتەوە، کە بەزارەوەی (کەریشکاندۆ) و (دیس کەریشاندۆ)، لە بەرزی و نزمیدا، بەناوبانگە و دەتوانێ جێگۆڕکێ بەو (چینانە) بکات و (چین) و (دەنگ) و هەراو (ڕەنگ)ی خۆی بگۆڕێ.

لە چێژی جوانخوازیی تۆ، تێ ناگەم، بەڵام فەرموو سەیری ئەم وێنە (کاریکاتێرانە) بکە و بزانە کامیان جوانترن و خۆت (سەرپشك) و (بنپشك) بە:

* ماکەرێکی چاویلکەلەچاوی چارلزلەبەر، بەسواریی پایسکلەوە.

* ماکەرێکی مینیچۆپلەبەری قژنیگرۆی شوفێری سوپەر.

* ماکەرێك بەسواریی نێرەکەرەوە، یا بەپێچەوانەوە و لە باخچەی ئاژەڵاندا.

ئا ئەوەتانێش هەر نەخۆشێك کە هەست بەداخی دڵ و بەکینە و بۆغز و حەسوودی و کورتانفڕاندنی خەڵك کرد، ئەوا دواداهێنانی پزیشکایەتی لە چاندنی دڵی (کەر)دا، گەیشتووەتە ڕادەیەك کە زۆر بەئاسانی (دڵی) ئەو نەخۆشە ڕقاوی و بوغزاوی و حەسووداوییە بە(دڵێکی) گەورەی کەر، نەك شتی تر، بگۆڕێتەوە و کابرای گۆڕین لەو نەخۆشییە پیسە چاك بێتەوە. ئەی باشە، باش، ئەمەیان شانازیی نییە بۆ (کەر) دەڵێن: کەر شتێك بخوا، هەر شتێ، کە ڕیا، بۆنی ئەو شتەی لێ دەردەچێ. خۆزیام بەخۆزیای ئەو ڕۆژەش کە مرۆڤی کەر میزی کەری بکردایە و ئەو دڵۆڤانانەی کە ئازار و خەمی عالەم دەخۆن، لە کاتی ڕیاندا بۆنی ئەو ئازار و خەمە، لووتی دنیای (مصالح)ی کەڕ و کاس و گوێچکەی کەڕ بکردایە. سەیریش نییە گەر بێ ڕێسا و قاعیدەی (کەرخەمیدس)یش ئاوا هاوتەریبی کەریۆلۆجیا بێت و بزەڕێ و بڵێ: (کل جسم إذا غمر فی الزونگاو والقور و لیتاو السیاسی، فانه یفقد من وزن کورتانه، بقدر القوراو المزاح منه ومن توتر دماراته وورگه و کلاواته...).

بەڵام ئەوەی جێی داخ و نیگەڕانییە، ئەوەیە کە: کەرەزانایەکی وەك (فرۆید) ڕۆڵی دیار و کاریگەری (کەر)ی لە خەونی نووستوواندا، لە نووستووان کەشکەك سەڵەوات، خستووەتە لاوە و لە ئاخوڕی کتێبەکەی (خەوننامە)دا، شوێنێکی وای پێ نەداوە، کە شایانی تەویلە بی. بەڵام دەڵێن: ئەم کابرایە زۆر لە (کەر) ترساوە، چونکە خۆی (نێرەمووك) بووە و نەیویستوە لە توانای سێکسیی کەر، بکۆڵێتەوە. بەڵام من لام وایە (ئاینشتاین)ی زانای کەر، بەتەواوی دەرکی بەمەسەلەی (شوێنکات) لە تیۆریی (نسبی)دا کردووە و

بەباشی شۆڕ نەبووەتەوە ناو تەویلەکەیەوە، چونکیم گەر بەوردی گوێی درێژی خۆی بۆ زەڕینی کەر، هەڵبخستایە، ئەوا جەنەی دەگرت و ددانی سپیی بەهەڵەی خۆی دەکرد، ئەمیش کە کەر دەزەڕێ، هەرچەندە، بیلا مانێ، مانای پەڕین دەبەخشێ، بەڵام بەهیچ چەشنێ، ئەگەر تێی ڕامێنێ، نازانی لە چ وەختێکا دەزەڕێ، ئەگەر شەو بێ، ئەوا نۆتەی بەسۆزی، داوای لێنەبووردن لە سترانبێژە قۆڕەکان دەکەم، دەنگە ئاسمانییەکەی، وات تێ دەگەێنێ، کە گوایە بەرەی بەیانە و زڕەی فینجانە، گەر ڕۆژیش بێ، پێت وایە نیوەشەوە و دنیا خامۆش. وا دیارە ئەمیش بەم فێڵە دەیەوێ لاسایی تیۆریی درۆجیا و چاووڕاولۆجیای ئاژانسەکان بکاتەوە. هەر بۆیەشە لە کەرستانی کوردەواریدا، چارەیەك بۆ ئەم (شوێنکاتی زەڕینە) دۆزراوەتەوە و گەر بیانەوێ کەر لە زەڕین بخەن، ئەوا دێن شەپکەدارێك، یا کەستەکێك بەکلکیەوە دەبەستن. خۆزیا بۆ دنیای فیکر و سیاسەت و ئەدەبیش ئەم چارەیە بەکار دەهات، توخوا دەسرەنگینی هەر لە کوردی نیشتمانوێران ناوەشێتەوە، توخوا ڕۆژی ئەوەش نەهاتووە، با هاتووە و لە بارە، کورد، جاری بەبایەخترین زانست (کەریۆزانستی – علم النفس الحماری) یا (ئەنتۆلۆژیای کەر) بدات. ئا ئەوەتانێ جارێکیان زەهاوی شاعیر توورە دەکەن و دەڵێن: (لولا الاکراد لهلك الحمار) واتە: (ئەگەر کورد نەبووایە کەر تیا دەچوو) ئەمیش دەمارەکەرانەی دەبزوێ و دەڵێ: (صدقتم صدقتم لولانا لهلكتم)، واتە: (ڕاست دەکەن ئەگەر ئێمە نەباین ئێوە تیا دەچوون.) کە خۆی لە خۆیدا، بۆ خۆی باشترین بەرپەرچێکە، بۆ ئەوانەی لاف و گەزاف بەسەر خەڵکی ڕەشوڕووتەوە لێ دەدەن و دەخۆن و ناندێنیشی دەدڕن و چاوی لێ سوور دەکەنەوە و،(ترەفیدرالیشی)شی پێ ڕەوا نابینن. ئەمە و بەڕای هەندێ لە شارەزایانی زمان، مەبەستم زمانە هەرە شیرینەکەی کەر نییە، زمانەکەی خۆمانە گوایە: چاوگی بنەڕەتیی (کەر) لە (کار) کەوتووەتەوە، دوور نییە (تحولاتی تاریخ)ی ئەم وشە جوانە، لە ڕۆژی پەیدابوونی

(زێدەبایی – فائض القیمە) وە دەستی پێ کردبێ، کە تازەبەتازە (کەر و کار) لە کوردستان یەکەم هەنگاویان هەڵهێنابێ و بەڕووی زۆرداری و ڕووتاندنەوەدا زەڕیبن، زەڕیبن، زەڕیبن.

دەمێکیشە، جۆرە تیۆرییەکی ناهەموار و (کەرنڤیژنیزم) کەوتووەتەوە وهەندێ لە پسپۆڕانی (دەردەکورتان) بە(کەریزم) ناوزەدیان کردووەجارجارەش (اشتقاقات)یش لێ دروست دەکەن و جاشۆلەی وەکو: (کەریلۆف) و (جاشۆڤسکی) و (جاشیلۆف)ی لێ دەزایێنن و بەدەم پێکەنینێکی خەفەتناکەوە، ڕووی دەکەنە ئەوانەی کە بەساختە و بۆ چاوبەستن و ڕاوەڕێوی، خەریکی (کەرترڕناشنالیزم)ێکی کورتان لەنگ و گێڕ و گەوارن و ئامادەشن لەو پێناوەدا هەموو کورتانی خۆیان بەخت بکەن، کورتان و بەس، نەك ماڵ و سامان و ڕەسید و قەسر و قەمارە و سەفەری هەندەران. ئا ئەوەتانێ کەرەفەیلەسووفێکی وەك ئەفلاتوون لە کۆمارە شلۆقەکەیدا دەڵێ: (هەموو کەسێ دەحەسێتەوە و پەلی لێ ڕادەکێشێ و کورتانی تێکۆشان فڕێ دەدات و (ئیستغلال و میستیغلال) نامێنێ و (کەر)یش، بەحەتمی، دەبێ لەوێدا بحەسێتەوە هیچ جۆرە بێگارێکی (ناتاریخی)ی پێ نەکەن. "تۆ بڵێی وا بێ، ئەمە فشەخەونێکە و هیچی تر. بەڵام خۆ ئەوەتانێ لەگەڵ هاتنی پڕ لە شانۆشکۆی کورتانداری (داروین) کەر جێگەیەکی باشی پێ دراوە، گەلێ کەس لەبەر خوێندنەوەی ئەڵقە بزربووەکانی (نەژادی چەشنەکان) لە زوڵم و ستەمیان (پاشگەز) و (پێشگەز) بوونەوە و لەبەردەم (کەر و پەیکەری کەردا) ملکەچ و شەرمەزار بوون و بەچاوی شانازی و ڕێزلێنانەوە سەیریان کرد. ئەمما چ سەیرکردنێك، نێك، نێك! بەتایبەتی گەر بهاتایە (کەرێك لەبەردەم لایەنگرانی داروینداا ڕەت بووایە، ئەوا هەر هەموویان (کەرنۆش) یان بۆ دەبرد و بەشەپقەی سەریانەوە سڵاویان لێ دەسەندەوە. چونکە ڕایان وابوو، کە (کەر) زۆر لە (مرۆڤ) نێزیکە و، بەپسمامەکی هاوخوێن و هاوجووتە و

هـاوهـاوار دەژمێردرێ. ئەمە و نـاوی سەرسوڕهێنی (کەر) لە گەلێ داستـان و ئـەفسانـەی فـیـرعـەونستـان و سۆمـەڕستـان و بـابـیلستـان و هـیـندستـان و عەجەمستان و چینستان و یۆنانیستاندا هاتووە و هیچ هـاوڕەگێکی بەقەد ئـەو، دەوری و دیـاری مـێژوویی، لـە دروستکردنی کۆنـە شارستـانـیـیـەتە سمدارەکاندا نەگێڕاوە. (کوردستـان)یش هـەر مەپرسە، لەپاڵ ئەوەشدا (کەر) لـە (مـنـطـلـقـات)ی تـرەوەش سەرهـەڵدەدا و لـە کونـە تـەسکـەکـانـی تـەویلـە تەئریخییەکانەوە، بەچاویلکە ڕەش و قەتمەرەکەی تەماشای چایەرەکانی ژین دەکات و بەکوڵ و کۆڤانەوە و بەدەم (خەیام)ەوە دەزەڕێ و دەڵێ:

**می بخور، منبر بسوزن، آتش در کعبه زن**
**ســـــاکن بتخانه باش و مردم آزاری مکن**

ئحم... ئحم.... کەریش وەکو هەموو ئاژەڵێکی (خواپێداو) شوێنی خۆی و زادگـای خـۆی هـەیـە و پـێوەندییـەکی دایلـەکتیکیش لـە نێوانـیـانـدایـە. ئـا ئـەوەتـانـێ (وەرتـێ)ی خـۆمـان لـە ئـەسڵدا دایـەنگـەی کـەری کـوردستـانـیـیـە، هەموو کەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش وەك دەڵێن لە پزدانی ئەم کەرە نەجیبە کەوتونەتەوە، شاری (کەرکووك)یش پێوەندییەکی ڕۆحییانەی بەم کەرەوە هەیە و گەورەترین "احتیاطی نەوت" لەوێدایە و لەوێوەش دەڕژێتە نێو قورگی هـاروهـاج و چاوچنۆکی جیهانی یەکەم و دووەم و سێیەم و دەیـەم و بۆیـەشە، میللـەتـەکەی ئـاوا پـچڕپـچڕ و چـەواشەکراوە و (تـقـاریـرە سرییەکانی) نیو دۆلابەکانی NU وا دەڵێن والله اعلم.

هـەرچی چۆنێك بێ، بـا دەنگی نـاخۆشیش بێ، کەی وایە، بەڵام خۆ ئەویش حەقی خۆیەتی (تەعبیر) لە (تاسە و سۆز)ی خۆی بکات، بەدەنگێکی نزم یا بڵند، کورت یـا درێژ، کەمتاکورت، بزەڕێ. بـا گوێ لە دەمەتەقێی نێوان ئەم کەرە بگرین کە لە جۆرکی (مرۆڤ)ێك هەڵێنجراوە:

کەری یەکەم:

حەچە کەرە، وەك خۆم کەرە
بڕۆ ناو لەوەڕ، بزەڕە
حەچە یەکڕەنگ، حەچە یەکڕوو
حەچە. هۆگری داربەڕوو

کەری دووەم:

بەشمان شەق و تیَ هەڵدانە
حەسرەتمان یەك تاقە نانە
مزراحی دەستی ڕۆژگارین
هێزمان لیَ ببڕیَ، بێوارین
پێمان دەڵێن کەرەگڕوو
حسێبمان بۆ ناکا، مێژوو
مێژوو، پڕی پاکانەیە
ڕفۆکە، زبڵخانەیە

کەری سێیەم:

دەی با یاخی بین لەم ژینە
ئەم کارە، جێی ئافەرینە
داستانی گەورە، بەرپاکەین
چیدی کە نۆکەری، نەکەین
باری ناحەزان هەڵنەگرین
توولەڕێی سەربەستی بگرین

کەرەکان بەکۆرس:

دەی با تاریکی نەهێڵین
خەرمانی زۆردار بشێلین
بەیەك دەنگ هەموو پێکەوە
بڵێین، ڕزگارمان بوو، ئەوە

نـەمـا، كۆتـێ، لـەم دنـیـایـە
چونكە نەوەی كەر، ئازایە

ئـاوا هـەر لـێرەشدا، جـێی خـۆیـەتـی، بـەهـەستێكی كـەرانـە و بـەمـووچڕكـی بـەلـەزەتـی كـەرایـەتـیـیـەوە، بـەهـەڵتیزانـەوە بێین و هـەندێ نـهێنیـی ئـەم (كەرنامە) و (كەریزم)ە بدركێنین، كە تا ڕۆژ دێ و شەو دەڕوا (دەزێ) و (زاوزێ) دەكا و وەك ئالۆشی ئاگرناك تەشەنە، تەشەنە دەكا و گەرا و كرمە وردیلەكانی گەندەڵی یەك دوای یەك قاوغە دەشكێنن و پەرش و بڵاو دەبن و تـەتـرشێن و (شتـەكـان)یش دەتـرشێنـن، ئـەمما تـرشاندن، تـەحـا! تـرشا... دەترسێنێ... ترشێنرا... هاتەترشاندن! كەواتە دەس لەناو دەس و جۆرك لەناو جۆرك، بۆ ترشاندنی شارستانییەتە ترشاوەكە.

* سەرنجی یەكەم:

جۆری بەكتریای ئەم ترشكارییە، تا ئەمڕۆ، لە كون و كاژێركی هیچ جۆرە فـەرهـەنـگـێكـی تـۆژ لـێنـیشتـووی زانستـیـدا، نـاوی نـەهـاتـووە، هـیـچ ئـیـنسكـلـۆپـیـدیـایـەك پـێی شاد نـەبـووە و گـلـێنـەی تـیـژبـەزی هـیـچ میكرۆسكۆبێكی چەرخی كەریلۆجیا پەی پێ نەبردووە.

* سەرنجی دووەم:

ئەوانەی دەیانەوێ، بەوردی لەم بەكتریایە، بكۆڵنەوە و سەنگوسوژنی كەن و ڕازەكانی بزانن، با هاونشینیی كەران بكەن و یاوەری شەو ڕۆژی كەراندنیان بن و فێری جووتكەوەشاندن و كورتاندراندن و زەڕاندن بن.

* سەرنجی سێیەم:

ئەم دەمەتەقێیە لە تەویلەیەك و لە نێوان كۆنەكەرێك و جاشكۆڵەیەكدا هەڵایسا:

– كەرایەتی!

– چۆن چۆن؟

– کەرایەتی!

– ئێ یانی چی؟

– کەرایەتی و بڕایەوە.

– ئێ ئەی ئەگەر بەباشی لێت حاڵی نەبم؟

– وەی ترحێو، جا لە من مەگە و لە کەرەکان بگە.

– جا چۆن تێی بگەم؟

– من تەنیا (ئەلفوبێ) یەکەت پێ دەڵێم و بەس، ئەوانی تر، خۆت مشووریان بخۆ.

– قەینا... گوێڕایەڵم.

**"دەس بەزەڕینێکی بێ ئامان دەکات"**

* کەرایەتی قسەهێنان و قسەبردنیزم.

* کەرایەتی پاشقولگرتن و نانبڕینیزم.

* کەرایەتی ویسکی، نەك ماستاوساردکردنیزم.

* کەرایەتی بەڵێ بەڵێ، فەرموو فەرموو، قوربانقوربانیزم.

* کەرایەتی کینە و ڕق و فیشکاندنیزم.

* کەرایەتی هەڵبازی و هەڵفریواندنیزم.

* کەرایەتی چەپەڵۆك بەسەر و خۆ بەهیچ و پووچ زانیزم.

* کەرایەتی منمنیزم.

* کەرایەتی حەقم چییە و لێخوڕیزم.

* کەرایەتی چاوچاوانێ و برۆ هەڵتەکاندنیزم.

* کەرایەتی فەلسەفەلێدان و خۆ بەلەندەهور زانیزم.

* کەرایەتی کفندڕیزم.

* کەرایەتی موزایەداتیزم.
* کەرایەتی گرووپگرووپیزم.
* کەرایەتی خەڵکخەساندنیزم.
* کەرایەتی سادیزم.
* کەرایەتی ماسۆشیزم.
* کەرایەتی سادۆماسۆشیزم.

لەتەك جرتێکی درێژنیزم.

ئا بەڵێ ئەوەی تەحەکوم، بە (شتەکان) دەکا، رۆماتیزمی ئەم (ئیزم)ە دزێوەیە، کە هەموو (شتێکی) ئەم ژیان و بوونە(دەترشێنێ) و ئەم هەموو (کەرایەتییەش) دەخاتە سەر، کۆکتێلە بێشەرمەکان و خوانە ڕازاوەکان و کوشندەترین پەتای ڕێبازیزمی شاریستانیزمی چەرخی چەپگەڕی کەریلۆجیایزم دروست دەکا. دە ئێستا چی دەڵێی، بڵێ، دوور نییە. ئێستا هەزاران پرسیار بەمێشکی بەژاوەژاوی پڕ لە ناڵ و بزمارتدا بێت، پێ بکەنیت، دەرمارت گرژ بێت، جاڕس و هەراسان، دڵت بگوشرێت وشەق بات، بۆ خۆت و بۆ من و ئەوان و بۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتی، بۆ، بۆ، بو، بگریت و بڵێیت:

**دەخیلم داخیلی تەئریخی کەن ئەم وەزعە بۆ عیبرەت**
**ئەوەی ناودارە بێ ناوە، ئەوەی بێ نـــاوە نـــــاودارە**

سەیریش نییە، گەر لە کوردەواریدا، هەزاران کەرمیز بۆ کەر دۆزرابێتەوە، بۆیە کورد بیەوێ یەکێکی ئازا و چاونەترس هەڵسەنگێنێ، بەتایبەتی لە ڕۆژی تەنگەتاوی و هەیهاوهەیهادا دەڵێ: (کەر ئەوەتە لە کاروانسەرا بزەڕێ) بۆ قرساندنی ئایەومایەی قۆڵبڕە قرچۆکەکان، کورد بەدەم ئەو هەتیوچانەوە دەڵێ: (کەرەکت نەبێ، کەرەك نایێنی). بەمرۆڤی ئەمەکحیز و بێ

دەسەڵاتیش دەڵێ: (کەری بردە سەر کانی، کورتانی هێناوە بەشانی) ئەوانەی بەتەماین لە پاشەڕۆژ ببن بە (جاشوەزیر)ی گزیر و هەموو هەڵمەتەکاسەیییەك دەکەن، پێیان دەگوترێ: (کەری نەکڕییە، کورتانی لۆ دەکا.) دەڵێن: کە یەختە دەچێتە ناو نێرەکەران دەزەڕێ، کە دێتە ناو ماکەرانش ناتوانێ بپەڕێ، دیارە ئەم جۆرە کەرانە هەم (شذوذ) یان هەیە و هەم گرێی ئۆدیب. جا بۆ نا؟ بۆ مرۆڤی چاوقایم و هیچوپووچیش کورد دەڵی: (دەهۆڵیان لۆ کەری لێ دەدا، دەیگۆ ئەرێ ئەو تەپەتەپە چییە؟) ئای لە زەمانێکی وا چەپ و بەدنمەك کە: (ساحیب مەڕان دەنێرتە کن ساحیبی کەران، لۆ قیچەکی روونی سەران.) بەڵام با گاش بیکا و کەر بیخوا، با کارکردەکان کار بکەن و گانانیش پیرەکەر بیکەن، خۆ کێو بە لەقەی (جاشەکەر) نزم نابێ. هەتا مرۆی نارەسەنیش دەبتە پێشەنگ (گونی کەرێ دەبنە باینجان)، ئەم جۆرە کەرانە لەم هەراجخانەیەدا وەك مازییە شینەن و نرخێکی ئەوتۆیان نییە. نازانم ئەوانەی تووشی (سوئی هەزمی دەماغ) هاتوون چی تریان لەبارە؟ هەر ئەم کوردە، بەئەوانەی کەر لە قوڕدا دەگێن و خۆشیان کە (جۆ)یان دی نەفرەت لە (کا) دەکەن، دەڵێ: (کەر دوو ڕیاڵ، کورتان سێ قران.) ئەم وا دەزانی دنیا (ناڵچەیەکە) و بە کەیفی خۆی دەیسووڕێنێ، بەڵام نازانێ (کەر بەکاروان قەڵەو نابێ، با کورتانیشی بگۆڕێ.) با (پایە و پلە و ئایە و مایە)شی بگۆڕێ، نەء، کانتۆری پڕ لە قۆندەرەی ئیتالی و لاجانگی دووگەز و شانی پڕ لە نەجمە و نیشان، چونکە ئەم تەنیا بەردی دامە و شەترەنجە و تۆپی بلیارد، هەر کاتێك کە ئەسپێك ناڵ دەکرێ، ئەمیش پێی لێ هەڵدەبرێ و دەڵێ: منیش، توخوا منیش. ئێ پێم ناڵێن کەی کەر بەحەج بووە بەحاجی؟ خۆ ئەوەی بەپژمینی کەر دەحەسێتەوە و لە شەوێکدا سێ چوار قەمارەی ڕینۆ و مۆنیکا و ئۆپڵ و مارسیدس دەدۆڕێنێ و حەوت هەشت ئارتێست دەگۆڕێتەوە، کەچی بەکەشوفشەوە، سەیری مرۆڤی بەلەنگاز و نووسەر و هونەرمەندی گیرفان بەتاڵ دەکا، تا دەشتۆپی هەر لە

لەقەوەشاندن ناکەویٚ، کورد پێی دەڵێ: (کەر قەڵەویش بیٚ، ورگنیش بیٚ، ئەوروپاییش بیٚ، موزایەدەی یەکەمی مەبدەئیش بکا و بشبیٚ بە(شت) و بشتێنیٚ و بشکلێنیٚ و بشدڤلۆپێنیٚ و بشفلٚچێنیٚ و بشمیحوەرێنیٚ و هەزار جاریش خۆی بخاتە بەردەم قانوونی (عرض و طلب)ەوە، هەر بێزراوە و گۆشتی ناخوریٚ، کە دەشتۆپیٚ لە پێشدا قەل و داڵ چاوی دەفلیقێنیٚ و وتوویانە (کەر بەجۆ بمریٚ شەهیدە،) بەڵام کەی شەڕی هێستر و بارگینان، کەر و گای تیٚ دەچن، نەخوازەڵا کەرێك بۆنی زەعفەران نەزانیٚ و بەپارەی بەفریش کڕابیٚ، ئەوا لەنێو ئاوا نوقمەسار دەبێت، چونکە نە کەری مردوو جۆ دەخوات و نە لەم خاکە سەمەندەراسایە چەوەندەرێك هەڵدەکەندری. خۆ ئەوانەی کە بارتەقای کارەساتی جگەربڕ نەگرن، پێیان دەوتریٚ: (کەری پیر و هەوساری نوو، زەڕەزەڕیەت لە دەوری جۆ) بۆ کارەساتەکە، نا، بەڵام (جۆ) یەکە، ئا، چونکە ڕێژەی پرۆتیناتی هەموو ئەو خوانە درێژانەی، کە لە بۆنەکاندا، بۆ میوانانی جۆراوجۆر دەرازێنرێتەوە و جوانترین ئاخوڕی لیٚ دروست دەکریٚ. جا خۆت لە هەڵبژاردنی ئەو کا و جۆ و خوانەدا سەربەست بە. کەری ماندوو هەمیشە بەتەمای وەشەیە، کاتێکیش کەسەری کەری بگریٚ، سیف اللەت لیٚ دێتە پێش، سەریشت نەسوڕمیٚ و گوێشت نەلەقیٚ ساتیٚ کە دیت، هەندیٚ شت، هەر شتیٚ، تەنیا ناوی زلە و دێی وێران و ئەگەر کەری تێدا بکەویٚ دگانی دەشکیٚ، کەچی ئەم ئەوەندە ناگزوور و چنگڵەچزە، گەر کەرێك بتریٚ، ئەم کۆشی بۆ دەکاتەوە، بۆیە کورد بەتەوسەوە پێی دەڵێ: (کەرەکوڵ مەڕۆ هەورازە، چیت داوە لە ئێستری جەمبازە.) ئیٚ کەواتە: ئێمە بیٚ گۆڵك هەوسارمان بۆ چییە و تاکەی هەر بەپای پەتی، خەڵکی سادە بنێردرێتە ماشان و لەپاشان بەپێنجی پاك و پێنجی پووك بگەڕێنەوە و لە جیاتی برنج ماشیان دەرخوارد دەن. نەخاسمە ئەوانەی کە بەهەشتیان پڕ کردووە لە کەر و گا و بەبۆیاخ و خۆدزین و نازناوی زل زلەوەش بڵێن: (کەر بەستە، خاوەن دەستە.) چونکی هەر هەموویان (جاشی ماکەرێکن). واخ! لەم تەویلە بڵحەی

کە سەری گای تێدا دەخرێتە هینەکەی ماکەرەوە. چی دەکەی لە جیاتی ئەوەی میوان ببێتە خاوەنماڵ، خانەخۆی بووەتە ملشۆڕی میوان و و زاواش بەکەری خەساوی خەسوو. من بوومەتە بێگانە، بێگانە خاوەنماڵە. تا ڕۆژی ئەمڕۆش لە کەرخانەی کوردیدەواریدا، ئەگەر زارۆیەك بۆق بیگرێ، کە شیری کەری دەدەنێ، چاك دەبێتەو، تا ئێستاش ناڵی کەر بۆ چاوەزار دەکرێتە بەر دەروازەی دەرگای دەوڵەمەندە چەپەرەشڕەکان، هەروا جەستە و پیسایی کەر، گەلێ کاروباری دەرمانگەریی لێ دەرسکێ و نەخۆش دەتوانێ لە سای سایەبانی کەرەوە، خۆی لە هەزاران دەرمانی وەك پەنسلین و کەرۆماسلین و ئەسپین و ڤیتامینات دوور بخاتەوە، چونکە دەرمانخانەی کەرانە، پڕاوپڕ و تژییە لە تەرکیبات و مەلحەم و تەحلیلات و عەناسری جوێ جوێی سەیر، ئەم نهێنییەش تەنیا هەندێ دەرمانگەری قەڵپ و دایەنی دز و مامانی پیس و سستەری سووك و دوکتۆری تەماحکار دەرکیان پێ کردووە! بەڵام ئەوەی جێی سەرسووڕمان و (واقورکەرە) طبابەتی کۆن ئامۆژگاریمان دەکا، کە لە مێشکی کەر بسڵەمینەوە، چونکە بەڕای ئەوان، ئەوەی بیخوا، یا تەشریبەکەی بخواتەوە. تووشی (دەمارگرژی) و (فشەفش) و (دەبەنگی) دەبێ. خۆ گەر ژنێکی ئاوس و تینگاوتینگ بووش بیخواتەوە، ئەوا کەرەبەچکەیەکی یەجگار حەپۆلمێشی لێ دەکەوێتەوە و لە ئەنجامیشدا دەبێ بە (گیرفانبڕ) و (چەقۆوەشین)، من بەدووری نازانم، زۆریی کەر، چ لە جیهانی چەمووش و چ لەسەر ڕووی خاکی سووتاوی ئێمەدا، هەر لەم گرفتەوە هەڵقولابێ.

کەچی ڕایەکی تری خۆمانە هەیە و پێچەوانەوە دەڵێ: گەر دگانی کەر بخرێتە بن بالیفەوە، بەتایبەتی ئەوانەی تووشی (نزگرەی چڵێسی) و (داڵغەی دۆلار) و (ژانی خۆفرۆشتن) هاتوون، ڕاستەوڕاست چاك دەبنەوە و خەونی جڕنی و فڕنی نابینن. خۆ گەر جگەری کەر، وشك بکرێت و بخرێتە ناو چاوی ئەوانەی تووشی (گرانەتای هەڵپەرستی) بوون، یەکسەر بزەی کەرانە دەیانگرێ. خۆ گەر جگەرەکەی ببرژێنرێت و بدرێتە ئافرەتی

بە(ئینجە و فینجە) ڕوحسووك دەبێ و واز لە ترزلی دەهێنی. وردەی ناڵی کەریش بۆ نەخۆشیی بەڵەکی و (گرێی کۆنەخوازی) یەکاویەکە.

ئەوانەی مایەسییریان هەیە، گەر بێتو کۆمیان بە(خوێنی سوور)ی کەر چەور بکرێ دەقاندەق ژانیان دەشکێ. شیری کەریش بۆ مناڵی (نازدار) و گرینۆك زۆر بەکەڵکە. قەرسەقولەکەیشی بۆ نەخۆشیی کۆڵنج و (ژانەورگ) و (ئەسقەربووت) و (بەلهارزیا) و (بێحەیایی) زۆر بەسوودە. ئەو کەسەی چاوی ئاو بکا و نەتوانێ (فیکری گەورە) و (داهێنانی گەورە) بخوێنێتەوە، یا (وضووحی ڕۆیا)ی تێك چووبێ. ئەگەر بەقووڵی و بۆ ماوەی مانگێك سەیری چاوە گەورۆنە و شیرینی کەر بکات و لێشی مۆڕبێتەوە، یەکسەر بەڵای نامێنێ... خۆ گەر شیری (جاش)ێك بدرێتە ژنی زەیستان، بەهیچ ڕەنگێ منداڵەکەی بۆنی مناڵێکی تر ناگرێ و مەناعەیەکی گەورەش دژی (داوێنپیسی) پەیدا دەکا.. دەشڵێن ئەگەر سەگ گوێی لە زەڕینی کەر بێ، مووڕەغەی پشتی ژان دەکا و نەفرەت لە (زەڕینی ناوەخت) دەکا. یا کە (بەرازێکی ڕەچەڵەك بەرازی دەسوەشێن) و (تینووی خوێن) بخرێتە سەر پشتی کەرەوە، دەسبەجێ گیانی دەردەچێ و دەتۆپێ، بەڵام بەمەرجێ گەر کەرەکە ڕانەکا و نەختێ (شارستانی) بێ هەر کەسێکیش گۆشتی بەکام و تامی کەر، بەخاوی یا بەکوڵاوی یا بەبرژاوی بخوا گاڵتە بە(حەقمچیەتی) و (ئیقلیمچیەتی) دەکا، دەشڵێن ئەگەر شەیتانی لەعنەتی، کەر ببینێ، واز لە (پیلانگێڕان) دەهێنێ. وا دیارە هەر شەیتان بەباشی لە (وێنەی شیعری) و تابلۆکانی هەندێ بەناو (گەلەری) حاڵی دەبێت و چێژی لێ وەردەگرێ. موعجیزاتی کەر هەر بەوەش نەوەستاوە، بەڵکو دەڵێن گوایە: ئەو کەسەی تووشی سووسەنەکی هاتبێ و لە ئەنجامیشادا بووبێتە مایەی ئەوەی گانی پێ نەکرێ، ئەوا گەر زلەمووی کلکی کەر ببەسترێتە لاڕانی (چەپ)ی، وا هێزی دێتە بەر، دنیا دەداتە بەر کێر.

***

## دەسکەوت

بەپێنووسی: کاك ئاندن

یەکێ لەو دەسکەوتە هەر تەڕوبڕ و باش و هەرە گرنگ و هەرە (هەرانە)ی کە لەم چەند ساڵانەی هەڵوەریوەدا بزووتنەوەی سەرفراز و خوێنینی کوردیمانی گەیاندە پەرپەرۆچکە، ئەو دەسکەوتە بەتام و کام و ڕامانە بوو، کە زمانە زیت و قۆزەکەمانی بردە ئەوپەڕی (میهر و ئەڤین) چەند شتێکی (ڕەزاسووك) و (مێشك تۆقێنەر)ی (چاوزەقێنەر)ی (گوێلەقێنەر)ی (دڵتەقێنەر)ی (گونپۆقێنەر) بوو، کە بەپێی (دیالیکتیکی) زمان هەم هەم هەم! دەبووایە ببێ و خۆی (ڕتووش) و لە (ماکیاج)بدا، وەکو:

(تیپ)ی نەرم و زۆر و نەرمۆڵە و (پیت)ی زبر و گڕ... (ل)ی سووك و چرووك، یای تەنگەستوور و لوولدرا و (ر)ی پووت یا زرتەبۆز، (ی) تەوسپێکراو یا گیڤ بوو.، (و)ی خانوومان یا هەتیمچە. (پاشگر)ی دامەنشۆڕ و (پاشگری)ی ڕووگرژ و ناقۆڵا. (ئە)ی نازەنین و (د)ی سمێڵبابڕ، لە (پێش و پاش) گشت شتێك و بۆ دواجاریش (ئاندن) و (دەئاندنێنێ) بوو.

خوا نەیبڕێ! جا بۆیە و هەر بۆ ئەوەش ئەم (دەسکەوتە) و (مافە مرۆڤایەتی) و (چارەیخۆنووسین)ە ڕەوایانەش، وەکو (دەسکەوتەکانی) تر لێفەی بەسەر دانەدرێ و لەنێو (پیلانێکی) گڵاودا نەڕووخێ، هاتم و وام بە (جوان) زانی ئەم چەند نموونەیەی دیارترینی ئەو دەسکەوتانە (بخەمە) نێو (قورگی) لەندەهۆری (گۆڕستانی) مێژووی داخدارەوە، ئەم وتارۆکە (وتار–وتاراندن–دەوتارێنێ)، لەوانەیە، هەندێ شتی سەیرەی لێ بڕەخسێنم، بەڵام نەك هەروا و بەهەوەسرانی و شت لە (گیرفان) دەرهێنان، بەڵکو بەپێی سەرچاوەی زمانە هەرە شیرینەکەمان، کە پڕاوپڕی شتی ڕەسەنی وەك ئەم پاشگری (ئاندن)ەیە و بەپێی قانوونی (بەرەوپێشەوە)

چوونی (داروین)ی بەزاوزێ و شفتەژێ، منیش بێم چەند وشە و زاراوەیەك (بئاندنێنم) و (بئارایشتێنم)، بەڵام چۆن (ئاندن)اندنێك... ئەمەیان مەگەر هەر خوا خۆی بیزانێ. ئاخ (دەسکەوت و دەسکەوتاندن) تەحا غەمە بێبنەکە، دە فەرموو.

هەرزە: هەرزاندن دەهەرزێنێ

دروشم: دروشماندن دەدروشمێنێ

نۆکە: نۆکەراندن دەنۆکەرێنێ

پیلان: پیلاندن دەپیلانێنێ

نەوت: نەوتاندن دەنەوتێنێ

کلك: کلکاندن دەکلێنێ

خۆماڵی: خۆماڵیاندن دەخۆماڵێنی

فیشەگ: فیشەگاندن دەفیشەگێنێ

دکتۆر: دکتۆراندن دەدکتۆرێنێ

سیمۆنیا: سیمفۆنیاندن دەسیمفۆنێنێ

تلفزیۆن: تلفزیۆناندن دەتلفزیۆنێنێ

کۆنسێرت: کۆنسێرتراندن دەکۆنسێرتێنێ

ئابووری: ئابووریاندن دەئابوورێنێ

هەرێم: هەرێماندن دەهەرێمنێنێ

ماست: ماستاندن دەماستێنێ

مایەسیر: مایەسیراندن دەمایەسیرێنێ

برا: براندن دەبرایێنێ

هم: هماندن دەهمێنێ

بنەماڵە: بنەماڵاندن دەبنەمانێنێ

عەشیرەت: عەشیرەتاندن دەعەشیرەتێنێ

سۆشیالیست: سۆشیالیستاندن دەسۆشیالیستنێنێ

سنوور: سنووراندن دەسنوورێنێ

سێکس: سێکساندن دەسێکسێنێ

سەرکردە: سەرکرداندن دەسەرکردێنێ

مەتریالیزم: مەتریالیزماندن دەمەتریالیزمێنێ

چاویلکە: چاویلکاندن دەچاویلکێنێ

سیاسەت: سیاسەتاندن دەسیاسەتێنێ

ڕۆشنبیر: ڕۆشنبیراندن دەڕۆشنبیرێنێ

کۆوار: کۆواراندی دەکۆوارێنێ

شیعر: شیعراندن دەشیعرێنێ

چیرۆك: چیرۆکاندن دەچیرۆکێنێ

ڕۆژنامە: ڕۆژناماندن دەڕۆژنامێنێ

زاراوە: زاراواندن دەزاراوێنێ

پێشگر: پێشگراندن دەپێشگیراندنێنێ

پاشگر: پاشگراندن دەپاشگیڕانێنێ

بەرنامە: بەرناماندن دەبەرنامێنێ

ئاخ: ئاخاندن دەئاخێنێ

ئۆپۆزیسیۆن: ئۆپۆزیسیۆناندن دەئۆپۆزیسیۆنێنێ

فیدراڵ: فیدراڵاندن دەفیدراڵێنێ

باڵەخانە: باڵەخاناندن دەباڵەخانێنێ

ئەکادیمی: ئەکادیماندن دەئەکادیمیێنێ

ئاژانس: ئاژانساندن دەئاژانسایێنێ

ئیزگە: ئیزگاندن دەئیزگێنێ

کورد: کورداندن دەکوردێنێ

چارەنووس: چارەنووساندن دەچارەنووسێنێ

پاشەڕۆژ: پاشەڕۆژاندن دەپاشەڕۆژێنێ

کەر: کەراندن دەکەرێنێ

هیچ: هیچاندن دەهیچێنێ

سەرنج: ئەمەیان، وەك گوتم، مشتێ بوو لە خەرواری. منیش لەبەر سروشتی ڕۆژگار نەمتوانی ئەوەی بەخەیاڵمدا دێ (بئاندنێنم). تۆش کەیفی خۆتە و سەربەستی لە جڵەوشۆڕکردن بۆ هەر (وشە و زاراوە و ناو و ئاوەڵناو)ێکی لەم بابەتە، ئەوەی هاتە یاد و سەرزمانت بێڵێ و (بێباك) بە، بەڵام لە زەوقی میللەت و میللییەت دەرنەچێ، بمیللەتێنە، ئەمما چۆن میللەتاندنێك. هم م م!

ئەمە و هەندێ (شت) و (مرۆڤ) هەیە بەهیچ کلۆجی. تەنانەت بە (کەرەتە) یا (پاژنەهەڵکێش)یش ناچتە ناو (ئاندن)ەوە، بە (ئاخ)وە.

## که دادیزم دەدوێ

بەخامەی: کوردێکی دادی

پێتان سەیر نەبێ، مەبەستم بەشان و باهۆ هەڵدانی (پەندی پێشینان) نییە. درێغ بۆ هەناسەی درێژی تۆمەتەرەقاویی جارانم. بەڕاستی زۆر (خەمساردم). گزوفتدانی من تەنیا بۆ ئەوەیە. سووچێکی تری (سەیر و سۆبەتی) شتەکان درەخەم لە ڕێی پەندەوە، فتت خۆش، فتدانت خۆش.

لەلای هەندێ لە (چاوساغ) و (ڕیشسپی) و (دەمڕاستی)یەکانی دادیزمدا، مانای (دادا) وا دەکەوێتەوە:

وشەی، دادا، تیژترین وشەیەکە بۆ دەربڕینی دەرد و شیرپەنجەی (واقیعی حضاری) و (اجتماعی) لە پەنای دادیزمەوەش (واقیعێکی نوێ) دێتە کایە، ژیان سەرجەمی ئاوێتەیە لە (ژاوەژاو) و (بگرە و بەردە) و (ڕەنگ) و (دەنگ) و (دەردەنگ)ی سەیر سەیر. ئەو هونەرەی کە بەپوختی (جەوهەری) ئەم شتانە وەدەردەخا، ڕاپەڕین و هونەری دادیزمە... کەواتە: بەم (چەمکە)ە، (گرانەتا) و (نەرمەتا) و (لەرزوتا)ی ژیانی ڕۆژانەی دژوارمان (بێباکی) و (لاملی) و (گەلۆری) و (داپڵۆسین) و (تێرور) و (چاوبەستن) و، و، و، و، و، تاد تاد تاد.

ڕەنگرێژی (قەوارەی دادیزمی کۆمەڵایەتی)یە. لەلای دادییەکاندا (هەستی هونەرمەندانە) بەندە بە (نەگونجان) و (نەسووتان) و (نەبرژان) و (ناهارمۆنی)، نا، نا، نا، نای شتەکان، یانی (بابەت) یا هەر نرخی نییە، یا هەیشی بێ شتێکی ئەوتۆ نییە، مەسەلەن: (قسەهێنان) و (قسەبردن) و (بوختان) و (گوێزبژاردن) و (خۆتێقورتاندن) و (تۆ) و (ئەو) و (ئێمە) و (ئەوان) بایەخێکی ئەوتۆیان نییە. بۆیەش و هەر بۆ ئەم ئامانجە، دادیزمەکان سوودێکی فرەیان لە (پانی) و (درێژی) و (یەکڕوویی) و

(دووپاڵو) وەرگرتووە، بەتایبەتی لەو شتانەی کە (جموجۆڵ) و (بزاڤ) یان تێدایە وەك: (ڕدێن، سەما، کەوان، تیر، بازنە، بەگوێی مامۆستا، شێرەبەفرینە، کلکی ئەسپ، پێستی سەگ، مەسینە، مایۆ، سیسەم، کلینیکس، کەپسولی منع الحمل، بانیۆ، لیفکە، گوێچکەی کەر، پایپی سیاسی، جانتارەشەی دیپلۆماسی، کونەماسی، شاخی عاسی، تەرەماش، کۆنەئاش. مالی بەلاش.) یانی ئەمانە بە دوای شتێك وێڵن کە (ناوێزە) و لە (ئەندازەبەدەر) و (نابەجێ)یە. لە پێناو خوڵقاندنی دنیایەکی (لامعقول) و سەیرە لە کۆیە!! سەربای ڕووتکردنی شتەکان لە (چەمك) و (ناوەڕۆك) و داماڵینی هەر ئەدگار و خاسیەتێکی (عاطفی) و (نفسی) و (سێکسی) و (کۆمەڵایەتی) و (طبیعی) و (حیوانی) و، و، و، و، و. لە خودی شتەکان. جا گەر بێو بتوانین ئەم (مفاهیم)انە لەسەر پەندی پێشینانی خۆمان بسەپێنین و بەگیانێکی (دادیزمانە) بچینە نێو تانوپۆی ئەو پەند و دانە گەوهەرییانەی کە باب و باپیران و داك و داپیرانی ئێمە پێش، زۆر پیش (هۆگۆبڵ) و (دوکتۆر دەبڵ یوو) و (پریتۆن) و (بۆشنێ) و کێرفووت) و (هەڵسم) و (خاتوو نۆرتۆن) و (وانزەن بەگ) سازیان داوە، دەبێ لە ئۆقیانووسی ئەم پەندانەدا چیمان چنگ کەوێ؟ بێگومان هەزاران وێنە و تابلۆ و ڕواڵەت و دیمەن و پەردەی سەرسوڕهێنی (گرنگ گرنگ) و سەدان سەد (کەریکاتێر)ی وا مەگەر هەر کەڵەدزە جیهانی پڕ لە ئاشوپاش، لێی حاڵی بن و چێژێکی (مەدەنیانەی)ی لێ وەرگرن، داوای لێبووردن لە مامەڕەزای شاعیر و شای کاریکاتێریستەکان دەکەم.

با بێمە سەر (ئەسڵی مەقسەد) و بڵێم: پەندی کوردیش، فکیری سادە و فەریك و زیرەکی کوردیش، عەمبارێکی زۆر بەربلاو و (مەزن)ی هاویشتووە لەم مەیدانەدا. کەم پەند هەیە، بەقەد پەندی ئێمەمانان، ئەوەندە شۆخ و دووربین و (پەندی جەنگاوەر) و (مەردی کۆڕی شەڕ) بێ، با (ئازیزان) ئەوەش فەرامۆش نەکەن. کە من لێرەدا باسی پەند (ناکەم) ئەوەندەی

مەبەستم (تجرید) کردنی پەندەکان و داهێنانی کاریکاتێرەکەیە. لەو پێودانگەی کە دەبێ (پەند)یش، بەپێی (عەقڵیەت و مفاهیمی ئەم چەرخە) بگۆڕدرێت لە بیری هونەرمەندانیش نەچێ، هونەرمەندی ڕەسەن و هاوچەرخ، نەك هەر (پەند) و (سەردولکە)ی کوردی پڕاوپڕی ئەم کاریکاتێرانە. هەر بۆ نموونە کە لە فۆلکۆردا بەقەد خەروارێکە:

* بەسەر حەوت پشقڵا باز دەدا.
* عیسا گرتوویەتی، مووسا تێی ئاخنیوە.
* وای لە قونێ وای لە دۆشاوێ.
* مانگا بەدزییەوە کەڵ دەگرێ و بەئاشکرا دەزێ.
* جاران کاوڕباز بوو. ئێستا بەرازبازە.
* لەگەڵ گورگ شایی و لەگەڵ مەڕ شین دەکا.
* نانی کونەماسی دەخوا، پاسی جرتاوا دەکا.
* سەگ، ئێسقان بەزەبری کلکی دەشکێنێ.
* ڕیشی دەتاشێ. ئاوێنەشی دەداتە دەست.
* خەنجەر لە (کا) دەدا.
* خۆی لێرە و کلکی لە بەغدا تۆز دەکا.
* جۆ، بەدیواردا هەڵدەگێڕێ.
* سەرچۆپی بدەیتە دەس سەگ، بۆ لای سەبەتی نانی ڕادەکیشێ.
* بەعالەم سەگ دەوەڕێ، بەمن پشیلە.
* ئەمسەر دەکا، ئەوسەر دەکا، پارە دەدا و پینە دەکا.

أ

* دەرزی بکە بەخۆتا، سووژن بەخەڵقا.
* تۆپینی کەرو شاییی سەگە.

* تەشی بەکێری کەر دەڕێسێ.
* مژ لە قینگی کەر دەدا.
* کەسك دەدا و کێری کەر دەدۆزێتەوە.
* کەر چوو ئاو بێنێ، دەرپێی خۆی داکەند.
* ئەگەر کەرن بەرامبەرن، گەر هێسترن سەربەسەرن.
* بەکێری کەر لەسەر پشتی کیسەڵ بەیاننامە دەنووسێ.

ب

* بێژینگ بەدەرزی پێ دەکەنی و دەیگوت: کونی.
* بولبوول و لەقلەق نابن بەهاوڕێ.
* بۆ کوێر هەڵمەپەڕە، بۆ کەڕ گۆرانی مەڵێ.
* بەکلکی گوێز دەشکێنێ.
* بەمێوژ سمێڵی با دەدا.
* بەبۆنی کەباب هات، نەیرانی کەر داخ دەکەن.
* بەدوعای کەر، جۆ ناباریێ.
* چ باکمە، کوڕە کەچەڵ کاکمە.
* تاژی بەگزادەی سەگە.
* ڕەشۆڵە بووەتە کەفیلی چۆڵەکە.
* زمانی بەگشت لایەکدا دەگەڕێ.
* جەرەی باریك، لۆژنی قەدباریك.
* ختێ و فتێ ڕێك کەوتن.
* کورتان لۆمێروستان دەکا.
* جەنابی قازی، کەواکەت چەورە.

* شەڕ لە بادینان تۆز لە پێش ماڵی مە.
* لە گەرووی مار دەرهاتووە.
* لە بەرسیلە حەلوا دروست نابێ.
* ئەوەی منارە بدزێ، کیفیشی بۆ دەکا.
* ئەگەر هەندرێن بەغەمە، سەری زۆزك بەتەمە.

***

## ئاخێك

بەسمی: ئاخدارێك

ئاخ، تاکێکە لەو دەنگە دەروونییە قرچاو و برژاوانەی کە مانای دەرزیلە ئاژاندنی ژانێکی پڕ سفتوسوێ دەگرێتەوە. کە یەکێك تووشی دەبێ بەتووشی شالاوی شتێکی، هەر شتێك، ناشایستە و ئیفلیجی وا، کە سەدانی وەك کەشتییەکەی (نووح) پێغەمبەریشی تێدا سەرنگوون دەبێ. ئاخی بۆ دەکێشێ، لەجیاتی ئاخ، بەزاراوەی ئەمڕۆ. بەداخەوە و داخم ناچێ و داخەکەم، دەپێورێ. لە کۆنیشدا (پەککوو) لە زمانیشدا (داخ لە دڵ و داخ پێدان) هەیە، کە هەمووی گوزارەیەکی قیت و قۆز دەبەخشێ، ئەمیش کە وشەی شیرین و چاپووکسواری (ئاخ) دەگرێتەوە. خۆ وە نەبێ (ئاخ)یش تەسریف نەکرێ و لق و خەڵفی جوێ جوێی لێ بەر نەبێتەوە. لە زمانی کوردانی دێرین و ڕەحمەتی، باش وردبنەوە، باشتری لێ حاڵی دەبن. (ئاخم کێشا و ئاخ و ئۆخ و ئاخەئاخ) مشتێکە لەم خەرواره.

لەم دواییەدا کاك (ح)ی ئاشنام، برالەی خەمکی خەمان، پرزەبڕاویی بێ ئامان، ئەم وشەیەی خستە سەر دەمان، بەتایبەتیش لەکاتی بەدمەستیادا زۆری بەکاری دەهێنێ، لەگەڵ (پاشگر)ێکی ناقولا و چاوڕەش و بەدبەختادا. منیش بەئەرکێکی (زمانزانی) و (فەلسەفی) و بەپێداویستییەکی (مێژوو)ییم زانی، هەندێ لەم (ئاخ)ە بدوێم و نەختێ بەتانوپۆیدا بچمە خوارەوە، چونکە هێشتا زاراوەکە زۆر (فەریکە) و زۆر (ئاخ-کەس)ی وایشمان هەیە بەتەواوی لەم (ئاخە) نەگەیشتوون و پێشم وایە، تا ئەو ڕۆژەی کلکی حوشتر دەگاتە زەوی هەر تێی ناگەن. هەر بۆ نموونە، نەك بۆ مەبەستێکی گڵاو (خوا شایەتە) ئەگەر چیرۆکێکی (قۆڕ)ت بەرچاو کەوت، یا شاعیرێکی بێ (سەروپێ)ت، مەبەستم (پاچە) نییە، خوێندەوە، یا وتارێکی (بێگێڕ) ملی لێ نای، یا بەکتێب و سیپارە و

ڕۆمـانـێکـی دەعـەجـانـیـدا چـوویـتـەوە، یـا سەر و سۆراخـێکـی (شاخدار) و قسەیەکی (پڕوپووچ)ت بیست، یا کەوتیتە نێو ئاگردانی موناقەشەیەکی (بـیـزەنـتـیـیـانـە). یـا کـە دێت لـە جـێی شێران ڕێوی دەکـەن گـێران، یـا لـە (کەربازاڕی) ئەم چاخە بڵح و سەرقاڵە باش حاڵی نەبوویت، یا دڵت لەبەر هـەنـدێ (بـۆرەمـرۆڤ)ی خـەساو، بـوو بـەتڵقـەی مشکـەی ڕۆن و بـە تڵپـەی کـونـدەی ئـاو، تـرخـێنـەت لـێ کـرا بـەپڵاو، یـا کـە دیت لـە مـەیدانـی بـەهـارا گوێدرێژیش زەوقی خۆ لە خۆڵوەردان و چایەرە و کەیفەکەرانەی نییە و ناخوێنێ و نالووشکێنێ. یا هەموو میزاجی کوردەواریت لەبەر ڕێبازی هەندێ (کۆمپەنی) و (گرووپ) و هەندێ بیروڕای گەوج و گەلحۆ، کەوتە هەیداد و ڕۆڕۆ، ژین بوو بەمقۆمقۆ، دۆشاوت لێ بوو بەدۆ، نۆزدەت لێ کرا بەنۆ، های لە من و های لە تۆ. ئاخ خ.

یا یەکێك نانەڕەقەی جۆی دەس ناکەوێ و ئەوەی بەرامبەریشی دەرگای بەهەشتەکانی لەسەر کراوەتەوە. یا کە مافی (نەتەوە)یەکی بەجەرگ و لێقەوماو، لەنێو ژاژەڵانی تاکتیك و میکافیلییەتدا، وەك حەبی (ئیسپرین) بەنیوگلاس (وێسکی)یەوە قووت دەدرێ و حەق شار بەدەر دەکرێ، تاوان سمێڵی بابڕی دەسڕی، ئاخ خ خ. یا هەموو کەسێك دەبێ بەهەمزاغا و خەنە و وەسمە لە ڕدێن و سەر و بەری خۆی دەدا، یا کە نان بۆ قەساب و گۆشت بۆ نانەوا، بیر بۆ ئازاردان و (زەرنیق) بەدەوا، یا کە (ڕق و کینە) فشکاندن دەبێ بەپەیامی (نا)ی پیرۆز و جێگەی سەربڵندی و هەزاران تۆپە قوڕ لە چەهرە و چەغاری (جوانی) درا. کەر دەبێ بەمانگا و ڕێوی فێست لەسەر دەنـێ و ورچ شەفـقـە. کـاوێژکـردنـی (کـای کـۆن) بـەویردی سەر زمـان، لـە خشتەبردن بە(شۆڕشگێڕی)، دیسان ئاخخخخخ.

بەڵێ، کاکی برا، گەر ڕۆژێ دەیان تابلۆ و دیمەنی عەجایبی وەك ئەمانە لە (صندوق العجایب) و بارگە و بنەی دنیادا دی، خوێندت، یا بۆنت کرد یا بـیستت، ئـارەقـەی (شەرمـەزاری) بـەهـانـیـەت نـەتکـێ و ژانـەدڵ نـەتگـرێ و ڕیـخـۆڵـەکـانت کـیـنـگڵ نـەخوا و هـەدادانت بمێنـێ. خـەم لێت نـەبێ بـەچـیـای

ئارارات، ژمارەی زامەکانت، وردە و درشتی خەمەکانت، لە سنووریٚ ڕاگرە، گەر ئایدیۆلۆجیەکی تەواوی، دەبیٚ بزانیٚ با و بۆران و ڕەهیڵەی (خۆشەویستی) لەو ڕووکارە بڵحانە بەتەوژمترە، گرەو مەدۆڕێنە، هەناوت مەشڵەقێنە، لە (سلبیات) وازبێنە و وەرە سەرخەت، ئاخخخخخ! بەدەستاوێژی (زەلامترین) وشەیەك کە مانەندی کەمە و باوەشی بۆ هەمەوو (گەردون)ی گەورە کردووەتەوە، وشەی (ئاخ) بەڵێ: (ئاخخ) هەزاران هەزار: (ئاخخخ).

خۆ گەر ویستت، بەرپەرچی شتێکی (نابەجیٚ) و (قسە و قسەڵۆك) و (درۆ) و (تاکتیکبازی) و (گەڕەلاوژە) بدەیتەوە و لە ڕووی سەدان (بەها)ی سەر بەئەژنۆ هەڵبشاخێی، پێی ناویٚ بەوتاری درێژ درێژ، بەپەند و بەڕاوێژ، بەتیشکی لێزەری تیرێژ، بەبوختانی هار و گێژ، یا بەقسەی سەرەولێژ، بەفسەفس و بەکاوێژ، خۆت خەریك کەیت و میزاجی (پورتەقاڵی)ت بخەیتە هەڵەکە سەما، خۆت نقوم کەی لە خەما، ڕیسوا بیت لە عالەمادا. چاوت بنووقێنە، نەعوزیٚ بخوێنە، وەکو قاز بقیرێنە، مەپرسە، مەنووسە و مەترسە، تاقە وشەیەکت بەسە، وشەی شیرینی (ئاخ) دیسان و چەوەندەر و یاپراخ، ئاخخخ.

بەڵام یاغنیش نەبیٚ کە ئەم (ئاخە)یش گەلیٚ (پلە)ی هەیە، پێویستی بەئینسافە، بۆ ئەو کەسەی دڵسافە، ئاخخخخ یانی شت هەیە، وەڵامەکەی (ئخ)ێکە، شت هەیە (ئۆخ) و شتیش هەیە بە(ئۆوخ) وەڵامی دەدرێتەوە و شتی کەیش هەیە بە(ئیخ) و چەشنێکی کە بە(ئخخخ) و لە بارێکی تردا بە(ئا، ئا، ئا، خ) و شتی زەبەللاح و فلامەرزیش بە (ئاخخخ، ئاخخ، ئاخ). هەر لە کۆنەوەیش کوردی زیرەك و دنیادیدە. لە حیکایەتی (ژاڵە)ی گوێی ئاگردانی شەوانی درێژی (کوردایەتی) گوتویەتی:

ئاخم کرد و داخم کرد

سوورم کرد و بژێرم کرد و لێم نەخوارد

کەواتە: ئاخ، ئاخخ، ئاخخخ، خخخخ.

***

## وەختی هاتووە یا نا؟

بەقەڵەمۆکەی: کەرکووکییەکی لێقەومیاو

بەڵی شێخی گەورەمان، شێخی هەموو خامەبەدەست و دڵسۆزێك و خەمکی خەمانێك، هەموو ڕاپەڕیوێك لەسەر بنج و بناوان و ئەدگارەکانی ڕژێمی گەندەڵی داتەپیوو و کۆنە، ڕێژیمی (چاووڕاو) و (تاسی حەمام) و (حەمەی وەستا فەتاح) و (بۆ تەسك و تررووسکی) و (بۆ زگ و زا)، ئەو شێخە شیرین سوخەن و قابیل و خۆش تەبع و ڕەزاسووکەی، کە ئەم جارجارە (بێدەنگ) بووە، دەیان (عەبا) پۆش (کش) یان لێ کردووە، بەڵام کە لێیان (مڕ) بووەتەوە، سەرجەمیان خۆیان وەك هەمانەی فشکراو فش کردووەتەوە

ئەو شێخە هەوا بەرز و بەرچاو دڵڕوونەی کە خۆی بە(ئێستری ڕووتوقووت) و (ئەسپی) گۆڕین نەفرۆشتووە و ساتوسەوای بە(بیر و باوەڕ) و بە(ئایدیۆلۆجییەتی ڕەزایانە)ی نەکردووە، بەتیغی زمانی وەك خەنجەری ئەڵماسی، سەدان سەدانی وەك (مودیر)ی قزڵجە و (باب العلی) خستووەتە هەڵەکەسەما. هەمیشە لە ڕووی لە (ماینە کوێت)و خاوەنەکەی هەڵشاخاوە!

بەڵێ. شێخی ئێمە، شێخ ڕەزای زەمان، قدس اللە اسرارە، ئەو شێخە سەرازادەیە کە (واقەواقی دڵی) سەرچاوەی (کەشف و کەرامات) و بەپێی زاراوەی ئیمڕۆ (حدس و وضوحی رؤیە) بووە. ئەوەندە ئەو هەستی بەژانی کۆمەڵ کردووە، دە ئەوەندەش خۆی بەرپیش سپی و دەمڕاستی (ڕاستی) زانیوە، جگە لە (خوا)ش لە کەس نەترساوە و لە هیچ شتێ سڵی نەکردووە.

بەڵێ، چ شێخێك، بەقەد شێخی ئێمە (شابازی شکارەنداز)ی مەیدانی پەردە لە ڕوو داماڵینی (ناهەمواری) و (بەدڕەفتاری) و (فسۆس پاڵەوانی)بووە. شێخێکی (حەقیقی)یش نەبوو بێ، بەڵام لەسەر شاخ، مەبەستم قۆچ نییە، ڕۆیشتووە. با سەرنجێ لەتەك (شێخ)دا لەم (کاریکاتێرە)

سەیرە بدەین، ئینجا بزانین شێخی ئێمە چ (قاف)ێکە و هەزاران مێروولەی لاقشکاو ناتوانێ بەگژیا بچێ.

**ئاه، چ خۆشە، گوێی لە بنا خشت ببڕن**
**ریشی قوتکەن بەمەقەس بیکەنە مەیمونە قوتە**
**بەدەف و دایەرە و زەمزەمە دوی بکەون**
**لێ بدەن چەپڵە بڵێن: بێنەوە کوڕگەل ئەمەتە**

بەڵێ: شێخی ئێمە لەو (شێخ مەحشی) و (شێخ تەڕەماش) و (شێخ کونەڕەش)انە نییە کە قوتبەکەیان بە(ئاو و نیعمەتی) خەڵکی سادە و چەوساوەیە گەڕانی. شێخی ئێمە، شێخی ژانگرتووان و شەیدایانی چاوی ڕەشی (کوردە). ئەو شێخ و شاعیرەی، کە چەرخی چەپگەڕ سەد دەستی وەك دەستی ئەوی کردووە بە (زاخا) بەڵام (نەتۆقیوە) و (چۆکی دانەداوە) و (نەخەساوە) و هەر بەدەنگی (بۆ پێشەوە) بوو. خۆ ئەگەر جارجاریش (غەڵەت)ێکی دەرهەق کورد کردبێ، مەردانە و ڕەزایانە، کەوتووەتە ویزەی گیانی (خۆی) و هەزار تانە و تەشەر و نەشتەری لە (خۆی)داوە. بۆیە لە پەنای (دار المولکی بابانەوە) دەردی دڵی (کوردانەی) خۆی هەڵڕشتووە و ویستوویەتی (کورد)یش وەك هەموو میللەتانی (زەمانی) خۆی (ئازاد)بێ و خەونە شیرین و سەوزەکانی ئادەمیزادی کورد، وەك نەقشی سەر بەرد دەربچێ. ئەوەیشی فەرامۆش نەکردووە، کە هیزی ڕاستەقینەی گەل دەتوانێ ئەم (خەونە) جێبەجی بکا و بۆیە (زەحمەتکێشانە) وتویەتی:

**کەسی فەقیری بێچارە**
**گەر عەیبی هەبێ دیارە**
**دەوڵەمەندی ساحێب پارە**
**سەد عەیبی هەبێ مەستوورە**

بەڵێ شێخی ئێمە، ئەو شێخەیە، کە بەگیانێکی تەوس و لاقرتێ و سەرزەنشتەوە، هەستی بەمەسەلەی (دوویەرەکی) و (دەبەرەکی) و (دەردە کورد) دەکا و دەڵێ:

**با نەقەومێت و نەزانن ئەم هەموو شوور و شەڕە**
**گشت لەسەر بەرخی شەل و کاوڕە لەڕ و بزنی گەڕە**

بۆیە گەر لە ئۆڵکەی (شاعیری)دا لافی (شۆڕشگێڕی)یش لێ بدا لێی دێت. چونکە ئەم کە تیوریی (ساغ لە دنیادا نەماوە) و (گەر قسەی ساغت) دەوێی گوتووە، باشی زانیوە کامە دەردە و کارەساتە و کامە پەراسووی چەقیوەتە نێو دڵ و جەرگ و سیپەلاکی:

**لە سایەی دەهری دوونپەروەر، ئەمێستە لەك لە لەك دەدرێ**
**بەکۆڵێ کلکەوە، ڕێوی لەگەڵ کەوڵی دەڵەك دەدوێ**

مەبەستی شێخ، نائومێدی و دەستەپاچەیی نەبووە، مەبەستی (کورد فەرامۆش کردن) نەبووە، ئەوەندەی مەبەستی لە گرتنی ئەم (وێنانە) بووە، کە بوونەتە (شمڵی شەڕ) و (مۆتەکەی) کاروانی (کوردایەتی). نەخوازەڵا ئەو خووورەوشتە نالەبار و ئەو موناقەشە (بیزەنتییانە)ی کە لە (بەهاردا جل دەخەنە بان پشتی تانجی). بۆیە خاسمێرانە بەوان کەسانەی کە بۆ (تەکیەی فیکر و لێکدانەوە) دەڕۆن، دەبێ زۆر ئاگایان لە خۆیان بێ، ئەگینا دەفڕەنەکان لە پشتەوە دەیانپێکن، بێ ئەوەی لە گومەزی مزگەوت و تەکیەکان شەرمێ بکەن.

ئێ دەباشە، براینە برادەرینە ئەمن دەرێم: ئەگەر شێخێك ئەمە کردەوە و ڕەوشتی بێ، ئایا ڕۆژی ئەوەی نەهاتووە، هونەرمەندە ڕەسەنەکان و بەهانی ئێمەی (لەخۆبایی) و بە(کەشوفش) و (بابانوێران)، بەقەد بورجی (ئیڤڵ) (پەیکەر)ێك بۆ ئەم شێخە گەورە و نوورانییە، دروست کەن و بەهەر هەمووومانەوە، بەگشت حزب و گرووپ و ڕێکخراومانەوە، ڕەشبەڵەکێکی

شیرین لە ژێر ئەو (پەیکەرە) ساز دەین و بە(لالانەوە)وە بڵێین:

**دنیا لە دوای حەزرەتی شێخ ژێر و زەبەر بێ**

**وەك تاجی کەی و جامی جەم و بەختی زوحاکی**

**بەم حاڵە (پەرێشانەوە) باز اشهد باللە**

**شیعرت تەرەبەنگێزە ڕەزا شاعیری چاکی**

کەواتە: ئەی هونەرمەندە لێهاتووەکان، چارەیێ بۆ دروستکردنی ئەو (پەیکەرە) بدۆزنەوە دەستم دامێنتان. درەنگە، درەنگ.

***

# دەرمانی جرت

شێتۆکەیەك دوای ئەوەی دەکەوێتە نێو داو و دەهۆی سیاسەت و دوای ئەوەی پێنجی لا دەبێ بەپەنجا، پەنجا بەپێنج و دوای ئەوەی دەبێ بەسیاسەتوانێکی (عەجایب) و دوای ئەوەی لە پێناوی (ئارەزووی تەسکی) خۆیدا، هەزاران دڵساف و بێتاوان دەکاتە قۆچی قوربانی خۆی و دوای ئەوەی هەموو (ئەوراقەکانی) دەزڕێ. نەك دەزەڕێ. و دوای ئەوەی هیچی بۆ نامێنێ و پێنجی پاك و پێنجی پووك، تووشی شیزۆجرتینیا دەبێ و بەهەڵەداوان و بەنقەنقو دەیەوێ، ئەمجارەیان با بداتەوە بۆ سەر (کار و کاسبییەکی) تر، ئێ بەڵکو بتوانێ و دەرفەتە، ئەمجارەشیان و دوای ئەوەی، قۆڵی هەژارانی تر ببڕێ و کورتانی هەزاران بفرێنێ و (ردی اعتبارێك) بۆ خۆی پەیاکات، دێ هەندێ کەرەستەی وەك: بەهارات، کاریی، گەچ، خۆی، لەیموونەدۆزی، بیبەری تیژ، سابوون، زەردەچەوە، زافەران، گیارەش، تاد، تاد،دەکڕێ و لەگەڵ دوو سێ کیلۆی هەڵبژاردە لە فیکر و فەلسەفەی جیا جیا و ئایدیۆلۆژیاتی سەیر سەیر تێکەڵیان دەکا و دوو پەرداخە میزی (جاشکۆڵە)یەکیشی بەسەردا دەکات و دەیبا بۆ بازاڕی کارتلەکان و قۆنتراتچییەکانی سیاسەت و ئابووری و فەلسەفە و (ڕۆژنامەوانی) و بەم جۆرە جاڕی بۆ دەدا:

– چاکترین دەرمانی ژانەزگ و گون و گورچیلە، چاکترین دەرمانی لەهۆشخۆچوون و شلۆکی سێکس، چاکترین دەرمانی پشتەژان و گرێی شیزۆفرینیا و چاوئێشە و دەردەدڵ و نیگەرانی و دوودڵی و تەڵەکەبازی و جامبازیم پێیە. یەکاویەکە و بۆ گەلێ نەخۆشی تریش دەس دەدا.

کابرایەکی نەخۆش و لەخۆبێزار بەلایدا تێ دەپەڕێ، کە گوێی لەم هەموو ئاکار و وەسفە نایابانە دەبێت. کیسەیەکی لێ دەکڕێ و هەر تەنیا بەسەرەکەوچکێك تۆزێکی لێ دەخاتە سەر زمان، لە ئان و ساتا دەس دەکا

بە(جرتکێشان) و دەجرتێنیٚ و هەموو ماسوولکەکانی لەشی دەبن بە (جرت). یەکسەر بۆ سکاڵاکردن پۆلیسێك دەبینیٚ و دەیەویٚ لە دەس کابرای فرۆشیار شکایەت بکات و دەڵیٚ.

-کاکی جرت، پۆلیس، جرت.

پۆلیس تووڕە دەبی، کابرا نەختیٚ لە دەرمانەکانی دەداتیٚ و هێشتا ناگەنە لای ئەفسەر و بنکەی پۆلیسی قوڕ بەسەر هەست بەشتێکی سەیر دەکا، یەکسەر بۆ لای ئەفسەر و دەڵیٚ:

– قوربان جرت، گەورەم جرت، ئەمە، جرت.

ئەفسەرەکە وەك فیشەگە شێتە هەڵدەچی. کابرای گۆڕین نەختیٚ لە دەرمانەکەی دەداتیٚ و یەکسەر هەموو لەشی مۆریجانی دەکات و دەجرتێنیٚ و دەچێتە لای سەرۆکی بنکە و دەڵیٚ:

– گەورەم جرت، ببوورە جرت، ئەمن جرت، نازانم جرت، فەرموو جرت، تامی کە جرت.

سەرۆکی بنکەش نەختیٚ تامی دەکا دەڵیٚ:

– من جرت، حەقم نییە جرت، بۆ لای حاکم جرت، حاکم جرت. هەر هەموویان لەبەردەم حاکمدا دەجمێن و سەرۆك بنکە پێی دەڵیٚ:

– ئەمانە جرت، ئەمن جرت، هەموویان جرت، فەرموو تامی کە جرت، دەرمان جرت.

حاکم سەری سوڕ دەمێنیٚ و بۆ (ادلەی قاطع) ئەمیش نەختیٚ لەو دەرمانە حەیاتە دەخاتە سەرزار و پاش تۆزیٚ هەموو گیانی تێك دەچیٚ و نەفرەت لە هەموو قانوونەکانی سەرزەمین و ژێرزەمین دەکا و دەڵیٚ:

– ئحم جرت، ڕاستەجرت، وایە جرت، بۆ دەرەوە جرت، تەبریە جرت.

بەقەڵەمی: جرتخوازێك

***

## شەیتان و میتۆلۆجیا

لە میتۆلۆژیای هەر هەموو گەلانی جیهاندا، مەسەلەی مان و نەمان و ژیان و مەرگ و ئەم دنیا و ئەو دنیا و تاریکی و ڕووناکی و زەوی و پەری و جنۆکە و فریشتە و لەمە چێتر و دێو و درنج و مۆتەکە و شملی و شەڕ و ئەژدیهای حەوت سەر و ڕۆحی پاك و ڕۆحی پیس و شەیتان و ئەهریمەن و ئیبلیس، خۆی زۆر بەڕاشکاوی دەنوێنێ و زیاتریش ئەم بۆچوون و ئافەرید و گیانلەبەرانە، لە سروشت و کەرەستە خاوەکانی سروشت و لە واقیعی ژیانەوە، بەرجەستە دەکرێن، بەتایبەتیش ئاژەڵ و ڕوەك و ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ و ئاو، بەڵام. لە هەموویان سەرپەرتر و سەیرتر لەنێو ئەو میتۆلۆجیایەدا، دیاردەی (شەیتانە) و بەندیوارییەکی ڕەگاژۆشی بەهەموو جۆرە کردارێکی ناهەموار و سامدار و ترسناك و تۆقاندنەوە هەیە و لایەنێکی تری تاریکستانی نێو ناخی مرۆڤ و کردەوە نامرۆڤانەکەی مرۆڤ سەراوەڵە دەکاتەوە و جۆرە (ناو) و (نازناو) و (ناوناتۆرە)شی بۆ هەڵدەبەسترێ و جۆرە (کار و پلە)شی بەحەق و ناحەق! پێ دەدرێ. هەروەك چۆن لەم ناو و نازناو و کار و پلە (سەیر سەیرانە)دا خۆی (مەلاس) داوە:

* (کالێ): شاژنی شەیتان و لێپرسراوی دۆزەخە. لەشی ڕەشە و گەردانەیەك لە کەلەسەری ئادەمیزادەی گەندەڵ، بەملیەوە شۆڕبووەتەوە.
* (گایام): شەیتانی پلەی یەکەمە و (سەرۆك)ێکی مەزنی نێو دۆزەخە و زیاتر خۆی لە لاشەی شالووردا بەدەر دەخا.
* (کۆریل): شەیتانێکی (بچووك)ی داوێنپیس و دڵپیس و (تەماحکار) و سەماکەر. زیاتر لەبەردەم تریفەی مانگ و پەرستگاکاندا دەکەوێتە هەڵەکەسەما.

* (لامی): شەیتانێکی چاوزەق و ورگن و کینەدار و داخلەدڵ و (تەڵەکەبازە) و لە چۆڵ و بیابان دەژی و خۆی لە دۆنی (ژنێکی شۆخ و تۆخ) دەنوێنێ. زیاتر لە نێو گۆڕستان دەبینرێ و لاشەی مردووی تازە (بێگوناهان) دەکرێنێ.

* (لیمۆر): شەیتانێکی (نەفس نزم) و پلەنزمە و (بەدسیفەتە) و نمەکحیز.لە گیانی مردووی (دز و جەردەکان) دەگەڕێتەوە ئەم دونیایە و ئازاری خەڵك دەدا و (بانگاشە)ی خراپەکاری دەکا و مرۆڤی بێوەی دەتۆقێنێ.

* (یانگ گانیاتان): گیانێکی بەدفەڕ و شەڕانی و (هەوەسڕان) و (چاوچنۆك) و (ترزلە.) شەیتانێکی (بچووکە) بەڵام بە(شەو) نەبێ دەرناچێ و پێنچ پەنجەشی هەیە، کە دەیانخولێنێتەوە، تەشی ئاسا دەسووڕێ و ڕۆحی (مرۆڤپەروەران) و (مافناسان) بەبا دەدا. زۆریش حەزی لە زەندەقچوونی خەڵکە.

* (لووتان): شەیتانێکی منجرە و حەز دەکا میزاجی مرۆڤ تێك بدا، نەك زیانی لێدا، بەڵام جارناجارە حەز بە (ئاشووبنانەوە) و (فیتنەبازی) دەکا و خەبەری (ناخۆشی) پێیە و پیاوی بێ دەسەڵاتیش دەترسێنی.

* (یۆکۆباخ): شەیتانێکی ورووگێژە و پلە نزمە و پریشك لە لەشی (دەردەچێ) و (چەکدارە) و داهێنەری (تیری ئاگرینە) و لە دۆزەخیشدا بەرپرسی (نەوت) و (قیر) و (دارایی)یە.

* (هاپۆپووریم): شەیتانی (سووتاندن) و (ڕووخاندن) و (ئاگرتێبەردان)ە. لە دۆزەخدا بە(وەزیر) ناوی دەرکردووە. سێ سەری هەیە و هەر سەرەی لە (ڕەنگێکە).

* (مۆنۆلۆخ): شەیتانێکی زەبرەبەدەست و (تیروریستە). خۆی لەنێو فرمێسکی (دایکان) و خوێنی منداڵی (هەتیو)دا دەشارێتەوە. میرێکە لە (میرەکانی)، وڵاتی فرمێسك، ئەندامێکی کارا و باڵای (ئەنجوومەنی) دۆزەخە. سەرەکەی لە سەری مانگا و گوێی لە گوێدرێژ و چاوی لە گورگ

و لـووتـی لـه ڕێوی دەکـا. تـاجـێکـی شاهـانـەی لـه سەرە، عـەرەقـخـۆرە و (مەزەی) عەرەقەکەی لاشەی ساوای بێ باوکە و زۆریش (شەڕەتی) و هەرەژو مێبازی سووکە.

* (لەگیاتان): شەیتانێکی (زەمانبازی) بێ جورئەتە. ڕژگارەکەی لە کەر و مانگا و ڕێوی و سەگ و دووپشك و مار تێکەڵە. زۆر بەلەزەلەزە و حەز دەکا خەڵك (بتاسێنێ) و (کولێرەی) دەمی (هەژاران) بڕفێنی. هەر بۆیەشە دەسەڵاتێکی زۆر گەورەی لە (ئەنجوومەنی) دۆزەخدا پێ دراوە.

* (لۆسیفێر): شەیتانێکی قەپۆزدار و بەهڕ و بافە و (بەرمارە)ش دەخوا و لاجانگ درێژی سەر ڕووتەڵەیە کە پێت پێ دەکەنێ (ژەهر) دەڕێژێ و زۆریش حەزی لە (سەرەتاتکێ) و هەواڵە (قۆزتنەوە)یە و زوو زووش مرخ لـە ئـافـرەتـی بـێکـەس خـۆش دەکـا. زۆربـەی زۆری ئـەدگـار و خـاسیـەتـی شەیتـانـە چکۆلانـەکـانـی لـەگـەڵ خـۆیدا هـەڵگرتووە. هـەر بۆیـەشە لـەنێو (دۆزەخ)دا، دەسەڵاتـێکـی گـەورەی پـێ دراوە و زۆریش لـە (سەتـافـائیل) گەورەترە.

* (لیـۆنـار): شەیتـانـێکـی (دەسوەشێنی) ملـهوڕە و حـەزی لـە بـەکـامگـەیینی لاشاکـە... (سەرۆکی) هـەمـوو شەیتـانـە فـەرمـانـبـەرەکـانی دۆزەخستانە و پشکنەری (سیحری سادە) و (سیحری ڕەش) و (سیحربازەکانە). لە لاشەی بـزنـێکـی کـەتـەدا خـۆی حـەشارداوە و (٣) شاخـی تـیژی لـەسەر ڕواوە و هەردوو گوێچکەی لە ڕێوی دەکا. بە(خێسە) سەیری مێردمنداڵ و کچوڵان دەکا. مووی وەك نەشتەر تیژە و چاوەکانی خڕ و زەق و ئەبڵەقن و ئاگری (ڕق) یان لێ دەبارێ. ڕدێنی لە ڕدێنی بزنەگەڕ دەکا کە سیحربازەکان سیحر (دەگرنەوە) لەبەردەم مۆمدانێکی هەمەڕەنگدا سەری ڕادەمووسن.

بەخامەی: شەیتاندۆستێك

## چەند نرکەیەك

تەنزنووسە ڕۆح سووکەکەی خۆمان، وا لە ڕازی (ناز و نازین) دەنازێ و دەردەفرتێ و پەلامار:

باقووبە پرتەقاڵی
تاوس بەپەڕ و باڵی
خوشکەزا پارەی خاڵی

چنار بەڕەشاقەتی
ڕۆستەم بەقەلافەتی
شێر بەنەڕە و هەڵمەتی

ڕینگۆ بەدەمانچەکەی
پیکاسۆ بەفلچەکەی

سلێمانی بەسەیوان
پێمیم داستانی قەیوان

بولبول دەنگ و ئاوازی
بازاڕ پیاوی جامبازی

دکتۆر بەشەهادەکەی
هەولێر قەلاَ و جادەکەی
هەورەمان بەکلاَشی
مێژووی کورد پەنتەڕناشی

گەرمیان بەسەڵتە و کەوای
زانکۆ سومعە و مستەوای

سوید مافی ئینسانی
شیراز بەکچی جوانی

## نوشتۆکەیەك بۆ عاشقانی سەردەم

کوڕۆڵەی شۆخ و تۆخ و مۆخ کچۆڵەی نەرمیلەی وردیلەی نەشمیلە، گەر ویستتان بەیەك شاد بن و بچنە بن ساباتی عەشق و دووریش بن لە شەڕوئاشووب و زویربوون و کوشتن و سووتاندن و فڕاندن و ڕەدووکەوتن، ئەوا یەکسەر ئەمانە ئامادە بکەن و ئاوە تاڵخ و شیرینەکەشی فرکەن:

* «ئاوی چۆمی ترەکەڵەکێی درۆ و هەڵخەڵەتان، مووی بزنی سەرتەخت و بەخت و دڵۆپە ڕۆندکی مامزێکی ماندوو، جیقنەی مێشە سەگانە و هەزار پۆپنە، ڕێخی حوشتری دووکۆپانە، پرزەکۆخەی ترزلەکان، ئەوەی تیتی و ئەوەی بیبی». ئینجا لە شەمێی بگرن و بیخەنە نێو موبایلە هەراسانکراوەکانتان، بەمەش خۆڵ لە دۆشاوی ناحەزان و کۆنەخوازەکان دەکەن، یازدە جاریش لەبەر خۆتانەوە بەپرخە و لرخە ئەمە بڵێن: (ئاوەدان بێ هەریرە، هەرگوندێك هەزار موبایل و نۆ میرە.)

بۆ تاقمی حەپۆڵمێش و حەبخۆر و درۆزن و دوو ڕوو، تەمبەڵ و بێ وەفا و قسە ڕەق، شێخی شێخان وا دەشەکرێنێ:

**ئەم سادەڕوخانە، لە مەلاحەت کە تەمامن**
**دەورەت دەدەن و تەفرە مەخۆ، قەت مەلێ ڕامن**
**گەه دۆستی وەفادارن و گەه دوژمنی خۆێنخوار**
**دڵنەرمی دەکەن گاهو، گەهی سەخت کەلامن**
**مەعلوومە کە ئەم تاقمە وەك تاسی حەمامن**

# بەختەکەرانە

| بورجەکان | درێژەدادرِی | ژمارەی بەختەکەرانەت | رِۆژی بەختیاری و نەهامەتیت |
|---|---|---|---|
| (٣) رەشمە | لەگەڵ کاروانێك مەبە پێشەنگەکەی کەربێ، چونکە کاتی ئێستر و گا بەشەرِدێن، کەرەکە بەر لەقەیان دەکەوێ. | ٥٧ | تەوێلە شەممە |
| (٢) گۆێپان | رِابەر و کەس بەکەرمەزانە و واز لە مشەو گەندە خۆری بێنە، چونکە نەمنارە بدزە و نەکیفی بۆ بکە، نە کورتانیش بۆ مێرووولە دروست بکە. | ٨٧ | زەرِین شەممە |
| (١) جۆ | لە نووسینەکانت وربابە، چونکە باز هەیە و خەتەرلیش هەیە، کە دەوڵەت و کورسی و سامانت هاتە سەرێ، وەکی کەرێ مەزەرِە | ٧٨ | گوێ لەقشەممە |

سەرنجێکی کەرانە: ئەم خشتەیە لە خوارەوە بۆ سەرەوە بخوێنە، دەشتوانی لە چەپە بۆ رِاستە سەیر بکەی، خشتەیەکی جۆکەرە و یەکسەر بەختت دەنوێنێ.

| بورجەکان | درێژەدادرێ | ژمارەی بەختەکەرانەت | ڕۆژی بەختیاری و نەهامەتیت |
|---|---|---|---|
| (٨) هۆش کەر | نە ئاو لێڵ بکەو نەماسی بگرە، بەمانگای خەڵکێش مەڵێ وەحە، تا بە کەرەکەت نەڵێن هۆش | ٧٥ | کەرشەممە |
| (٧) کەرە کێوی | بڕوا بەو جاشکە مەکە، چونکە ئەویش هەر لەو کەرەیە، تا کەریش دەتڕی، ئەوەندەش وەعدەدا | ٥٠ | جاش شەممە |
| (٦) حەچە | ئامۆژگاری دەبەنگ و حەپۆڵ مەکە، کە کردت ئەو تەنیا (٣٣) مێش لە گونی کەرەکەی خۆی دەبژێرێ | ٨ | قەوچە شەممە |
| (٥) رەشمك | ئەمە لەبەرکە: ئەم کەرە نەبێ، کەرێکی تر، کورتانی دەکەم بەڕەنگێکی تر | ٧ | قەڕاسە شەممە |
| (٤) کەرتەشی | ڕابەر و کەرەکەت لغاوبکە، دەنا خۆی بە ئەسپ دەزانێ، بەکلکیش گوێز دەشکێنێ، لوشکەش دەوەشێنێ | ٥ | جووتکە شەممە |

| بورجەکان | درێژەدادڕی | ژمارەی بەختەکەرانەت | ڕۆژی بەختیاری و نەهامەتیت |
|---|---|---|---|
| (١٢) نێرەکەر | وا چاکترە تۆزێ لە چالاکیە سێکسیەکانت کەم بکەیتەوە، چونکە هەم... دەخوا و هەم گیرفان و خلافانت | ٧٧ | کورتان شەممە |
| (١١) ماکەر | نەکەی پلانی چ پرۆژە کەرانی دیکە دانێی، چونکە باڵەخانە و چێشتخانە و قومارخان و کچ خانەکانت لەکیس دەچێ و ڕەش دادەگەڕێ | ٥٥ | حەچە شەممە |
| (١٠) کەرگەس | وا باشترە مژ لە قنگی کەر نەدەی، چونکە کە ترپوە بە لووتتدا، برنجیش ئالیکی کەر نییە. | ٨٥ | لغاو شەممە |
| (٩) کەرکار | نەکەی خۆت لە قەرەی نامەرد و بێ وەفا بدەی، چونکە تووشی (ئەنفلۆنزای کەر) دەبی | ٥٨ | کرش شەممە |

بەختنووسێك

## ماستاونامه

* هەر ماستاوچییەك، ئەگەر قورگی تووشی ڤایرۆسەکانی ناوەوە و دەرەوە بووبێ و زمانیشی مووی لێ هاتبێ و گێربووبێ، پەنچە لەرزۆکەکانیشی هەڵوەریبێ، چاوی کز و گوێچکەکەشی کەڕبووبێ، ئەوا بنەمای بەنرخی چەند ئامۆژگارییەك هەیە، بۆ چاکبوونەوەی لە ڤایرۆسی ئەو پەتا کوشندەیە، وەك:

* دەبێ زۆر نە شرینگێنێ و کپ بێ و ژێیەکانی قورگی بەتوندی نەورووژێنێ و لە دیاردەی (ئەمسەر کەرێ و ئەو سەر کەرێ و پارەکەرێ و پینەکەرێ) خۆی بپارێزێ.

* ئەو جگەرانە بکێشێ و ئەو مەشرووبەش بخواتەوە کە لێقەوماو کەساسی بن دیواران دەیکێشن و دەیخۆنەوە، نەك وەك هەندێ لەو کەسانەی کە بەگونان شاخی گوێژە دەکێڵن و خەرتەلی خەتەری نێو ماستاو چیانن.

* دەبێ هەندێ لەو حەب و دەرمانانە بمژێ و بکرۆژێ و بلێسێ و بلووشێ، کە قورگ پاك و چاو ڕۆشن و ڕوومەت گەش و دڵ خاوێن دەکەن، لە قرخە و لرخە و پرخەش ڕزگار دەبێ. ئەوەش لەبەر چاو بگرێ کە عومری ماستاوچی هەرتەنیا چل شەوە و بەس.

* دەبێ ئەو کوللاجانە بۆ سەر زمان و ناواخنی مێشکی بەکاربهێنی وەك (ئەنتی بیۆتیك) و (ڕاستی بیۆتیك) و (ئەسیری دلازایی) کە زۆر زۆر دژی ڤایرۆسی (ماستاو) سازکردنی ڕۆژانە و (ویسکی) سازکردنی شەوانەیە، وریاش بێ کە دونگی دی نابێ وەك پشیلە هاربێ.

* نابێ لای ستەمکار ڕێوی و لای ستەمدیدە شێر بێ، دەشبێ جارجارە بۆ سەر چیای گاراو پیرەمەگروون و قەندیل و هەڵگورد هەڵبشاخێ و تێر تێر

ئۆکسژینی بێگەردی خاکەڕایی و وەفاداری هەڵمژێ و وازیش لە ماکەر مەلەیی و گەندەڵیزم و هەڵفریواندن بێنێ.

* گەر دەنگی نووسا و جگەرەی ئاوسا و هەناسەشی سواربوو، حەزیشی لە ماستاوکردن نەکرد، ئەوا باشترین شوێن ئەو کانیاوە هەڵزیپاوەی بەهارانە کە لێواولێوە لە کبریتی دایەلۆگی دیموکراسییانە و لە مەنگەنیزیۆمی برایەتی و ترشۆکی خۆشەویستی.
* پەنابردن بۆ خۆموتوربەکردن بەو دەرزییانەی کە بەتەواوی ڤایرۆسی ماستاوچییەتی لەناودەبەن، نەك خۆ خلافاندن بەهەندێ دەرزیی وا، کە ڕەگی ڤایرۆسەکە ڕەگاژۆتر و هارتر دەکا.
* لە کاتی تەشەنەکردنی ڤایرۆسەکە لە نیو کۆمەڵانی خەڵکی بێگوناح، نەخاسمە ئەوانەی خوویان پێوە گرتووە، وا باشترە شڵۆکی ئاسنیزم بەڕێژەی (١٠٠) گرام بۆ هەر لیتر میزی ماکەرێك و لەتەك دوو سێ پەرداخە مسکی ولالەنگی ئاوێتە بکرێت و بخورێتەوە، ئەویش لە ماوەی (٧) حەفتەی بەردەوام، چونکە یەکاویەکە، وا چاکتریشە دوو کەوچك لە هەنگوینی بێخەوشی کوردی و گوڵە مێخەکی وشك، لە کاتی نووستنی بێ گەوزاندن نۆش بکرێ.

ماستاوچییەك

## گەندەلوووس

* ڕێویــتــۆس Rewtus ئــاژەڵــێکــی ددانــگــڕ و سامــنــاك و دڕنــدەی نــێو ئەفسانەیەکی ڕەنگپەڕیوە، خۆی وەك بولبول دەنوێنێ کە چی هاوڕێی حاجی لەقلەقیشە، بەڵام لە بنجدا لەش و پەیکەرە نابووتەکەی لە شێوەی گورك و نیوەکەی تری چەشنی ڕێوییەکی پەتك لەملە (خانم واڵا)ی ژنی نازدار و خڕ و خەپان و نەرمونیانی بەگزادەی کچی شازادەی کەرمینۆسە karminus بەردەوام قاچێکی لە شام و ئەوی تری لە شیرازە، کە لەسەر خوانی ڕازاوەی شەوانی سووری خوێدا باڵ و مل و شان و ڕانی کۆترە کێویلە و مراویی نێو ئاوومامزی چاو خومار و سوێسکە دەقرتێنێ، وەك کیسەڵ کاوێژ دەکا و بەمێوژیش سمێڵی بادەدا.

* جارێکیان بەمۆزە مۆز و حەزێکی خەتەرناکەوە، دەیەوێ سکرتێرە بێوەژنە ئــاتــەشنــاك و ڕووسوورەکــەی خــۆی بــداتــە بــەر نــەقــیزە و گــەندەڵــی بکــا، بــەنــاچــاری ڕوو دەکــاتــە هــونــەرمــەندای جــادووکــار کــاك (کــاکــەلــۆس) Kakalusی هــاقــلــینــگــی تــا فــێڵــێکــی جــادووبــەندانــەی چــاوبــەستــانــەی بــۆ بــدۆزێتــەوە، ئــەویش بــەهــەڵــەداوان، نموونــەیــەکــی زۆر جوانــی دارینــەی ماکەرێکی بەئاڵۆشی بۆ دەکێشێ و خۆی لە ناخی دەشارێتەوە، بەمەش ڕێوییەکە هەڵدەفریوێنێ و لەگەڵ ماکەری گۆرین لەیەکێ لە ڕیستۆرانتە گــومــانــلــێکــراوەکــان و بــەئــامــادەبــوونــی (خــاتــوون لــووسی) خــاوەنــی ئارایشتگەی (لووس) جوتاوجووت دەبن، لە ئەنجامیشدا دەعەبایەکی زۆر سەیر و سەمەرەی لێ دەکەوێتەوە، کە نیوەکەی لە بنجدا لە ڕێویتۆس و نیوەکەی تری گورگتۆس ڕسکارە و ناویشی لێ دەنێن (گەندەلووس) کە لە ڕیشەدا ئالیکی دووکەری پێ دابەش ناکرێ، بەڵام بەکلکی دەتوانێت گوێز بشکێنێ و بەپەیغامیش ئاو بخواتەوە و زرێبارەکان وشك بکاتەوە...!

* ڕۆژانەش لەبەردەمی مایکەکان کورتان بۆ مێروولە دروست دەکا و ئاو دەکاتە ناو بێژینگ و لە ئاوی لێڵ ماسی دەگرێ و لە پەرسیلەش گەزۆ دەچنێ و بەحەلواش دەمەکان شیرن دەکا و بە(فلاش میمۆری)ش سەیری وێنە ڕووتەکان دەکات، لە هەمان کاتدا باڵەخانەیەك قووت دەدا و کیفیشی بۆ ساز دەداو خەڵك و خوای سادە و بەئەمەك و لێقەوماویش بە (دۆ) بمرێ شەهیدە، بەڵام نازانێ کە کەوتە گیانەڵڵا سەد داڵاشی لێ کۆدەبنەوە.

گەندەخۆرێك

## کەری، کا، تۆری

* بێژینگ بەدەرزی پێ دەکەنێ و دەیگوت: کونی.
* بولبول و لەقلەق نابن بەهاورێ.
* بۆ کوێر هەڵمەپەرە، بۆ کەڕ گۆرانی مەڵێ.
* بەکلکی گوێز دەشکێنێ.
* بەمێوژ سمێڵی با دەدا.
* بەبۆنی کەباب هات، نەیزانی کەر داغ دەکەن.
* بەدوعای کەر، جۆ ناباریێ.
* ئەگەر هەندرێن بەغەمە، سەری زۆزك بەتەمە.
* چ باکمە، کوڕە کەچەڵ کاکمە.
* تاژی بەگزادەی سەگە.
* ڕەشۆڵە بووەتە کەفیلی چۆڵەکە.
* زمانی بەگشت لایەکدا دەگەڕێ.
* جەڕەی باریك، لۆژنی قەدباریك.
* ختێ و فتێ ڕێك کەوتن.
* کورتان لۆمێروستان دەکا.
* جەنابی قازی، کەواکەت چەورە.
* شەڕ لە بادینان تۆز لە پێش ماڵی مە.
* لە گەرووی مار دەرهاتووە.

* لە پەرسیلە حەلوا دروست نابیٚ.
* ئەوەی منارە بدزیٚ، کیفیشی بۆ دەکا.
* لە ژیانی ئەدەبی و ڕۆژنامەوانیمدا، گەلیٚ جار لە کاریکاتێر دواوم، چونکە بەتاسە و چێژەوە حەزم لیٚ کردووە، بەڵام کام کاریکاتێر؟ ئەوەی لە ناخی ناخەوە دەتتاسێنیٚ و باری سەرنجی تازەت لە لا دروست دەکا، دیاردە شاراوەکانی ژیان و دەوروبەرت بۆ دەدرکێنیٚ و بزەی گەشیش دەخاتە سەر لێوتەوە، لەوانەیە بەقەد خوێندنەوەی ڕۆمانێکیش شتت فێر بکا و بتخاتە نێو جیهانێکی پڕ لە سورڕیاڵ و ئەبستراکتەوە.
* جاریٚ بۆ ئێرە ئەم چەند پەندە لە خەرمانی پەندی پێشینان وەك چەند نموونەیەکی زەقم هەڵبژارد، کە هەموو دیارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فیکری و سێکسی و دەروون – جوان و دزێو – و ئیستێتیکی دەگرێتەوە. خۆ گەر یەکێك بیەویٚ ئەوا پەندی کوردی لێواولێوە لەم وێنە سەیر و سەمەرانە.
* دەی دەبا ئێمە بەچاوی خەیاڵ و کاریکاتێریستە بەتواناکان – نەك بۆڕخواردوو – بەخامە و فلچە و ڕەنگەوە . دەی دە چ هونەرمەندێکی ئەم بوارە خۆشە، بەچێژبینی و تیژبینی ئەم پەندانە لە پێشانگەیەکدا دەنوێنیٚ؟

ئامادەشم هەر جارەی ٥٠٠ پەندی لەم چەشنانەی بۆ ئامادەکەم، چ دەڵێن؟

کەریکەتێریستێك

## هەسارە تازەکە یا تەویلە تازەکە

ئەمەیان لە قەیەکی بەهێزی نووسەری سەلیقە کەرێکە

زانا فەلەکناسەکان، هەسارەیەکی تازەیان دۆزیوەتەوە کە لە دەروەی کۆمەڵەی خۆرە و دەڵێن بۆی هەیە، مرۆڤ تیایدا بژی، منێك کە قەد بیرم لەوە نەکردووەتەوە ئەم وار و مەفتەنە جێ بێڵم بەلام ئەگەر بۆم رێك کەوت، حەز دەکەم سەردانێکی ئەو هەسارەیە بکەم و ئەم چەند پرسیارە ئاراستەی کاربەدەستانی ئەوێ بکەم:

- پەرلەمانتار و وەزیر لای ئێوە مەعاشیان چەندە و مانگێ چەند جار سەردانی خەڵك دەکەن؟
- بە چ بنەمایەك ڕاوێژکار و خەبیر دادەمەزرێنن؟
- شارێکتان هەیە ناوی کەرکووك بێت و لە جیاتی شوقە و خانوو بۆ ئاوەرەکانیان دروست بکەن، کەچی خەریکی گوندی ئەمەریکی و هۆڵەندی بن؟
- لای ئێوە بازاڕ چۆن کۆنترۆڵ دەکرێت؟ ئاخۆ هەرکەسە و لە ژێر دروشمی بازاڕی ئازاد دەداتە بەری؟
- زەوی چۆن بەسەر هاووڵاتییان دابەش دەکەن؟ ئاخۆ وەك ئێمە سێ جار زەوی بەیەك کەس دەبەخشن؟
- چەند وەزارەتتان هەیە؟ وەك ئێمە تەماتە و بامیە لە دەرەوە دەهێنن؟
- وەزعی کارەباتان چۆنە؟ هی بەرپرسان فوولە و هی هاووڵاتییانیش ڕۆژ و شەو، سێ کاتژمێر؟
- وەزعی سەندیکاکانتان وەك ئێمە بەتەوافوقە؟

– کۆڵان و شەقامەکانتان پڕ کردووە لە بارەگای ئەحزاب و میلیشیات؟

– ئەوەی دوو حەرفی نووسی، دەیکەن بەنووسەر و ڕۆژنامەنووس؟

– ژمارەی سەنتەر و ڕێکخراوەکانتان چەندە و هەروا بەگۆترە پارەیان بۆ سەرف دەکەن؟

– ساڵانە چەند ڕۆژ دەکەن بەپشووی ڕەسمی؟

– ئەملاك و عەقاراتی دەوڵەت چۆن تەملیك دەکەن.

– نووسەر و ڕۆژنامەنووس لە لایەن پۆلیس و ئاسایشەوە بانگ دەکرێن و تێکەڵ دەدرێن؟

– بەناوی مافی مرۆڤ و مەدەنیەتەوە پارەی حکوومەت لرف دەکەن؟

– ئەوانەی خیانەتیان لە گەل و نیشتمان کردووە پلە و پایەیان پێ دەبەخشن؟

– حزبە گچکەکانی ئێوە دوکاندارن یان موعاریزن؟

– لەسەر دوو وشەی هەق خەڵك تەکفیر دەکەن؟

ئەگەر وەرامەکانیان بەدڵم بوو و بەپێچەوانەی ئێوە بوو ئەوا لەوێ داوای پەنابەری دەکەم، خۆ ئەگەر لەوێش هەمان تاس و حەمام بوو، ئەوا بەسروودی چەند شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم دەگەڕێمەوە.

## سیلاك

جاران، بورغی سیلاك دەبوو، بۆری سیلاك دەبوو، پلاكی كارەبا سیلاك دەبوو، هەركە ئەو شتانە سیلاك دەبوون بەدانەیەكی تازەو مەزبوت دەگۆڕا و هیچ كێشەیەك ڕووی نەدەدا.

بەمرووری زەمەن، وای لێ هات خانوو سیلاك بێت، جادە سیلاك بێت، ئوتومبێل سیلاك بێت، خانووی سیلاكەوە رووخێنرا و بەنەخشەو كەلوپەلی تازە بنیات دەنرایەوە،جادە سەرلەنوێ دوای هەڵتەكاندنی قیربەقیری تازە چاك دەكرایەوە،

ئوتومبێل تەقاویتكراو ڕەقەمی جارانی لە ئۆتۆمبێلی مۆدیل نوێ دەبەستراو بڕۆ و بەخێرچی.

هەنووكە، كارەساتەكە گەورەبوو... دائیرە سیلاك دەبێت، دەزگا و دامەزرا و سیلاك دەبێت، بنیادەم سیلاك دەبێت، چۆن؟

* زەلام هەیە سیلاك بووە، توایتەوە هیچی لەسەر هیچ نەمایە، خواخوایەتی هەناسەكە بەتەواوی بدات، كەچی لێی ناگەرێن... لەم دائیرە بۆ دائیرە، لەم دەزگا بۆ ئەو دەزگا بەدەسەڵاتەوە نەقڵی دەكەن. كەچی چونكە سیلاكە، هیچ بەهیچ ناكات و سیلاكیش تەشەنەی پێ دەكات.
* هەیە گەنجە خیبرەی نییە، حیسابەكە سیلاكە، كەچی پشتی هەیە، بەغەڵەت تێی دەڕوانن و دەسەڵاتی دەدەنێ، لەم دەزگا بۆ ئەو دەزگا، لەو دائیرە بۆ ئەو دائیرە، كەچی ئەو (....) خۆی و گێزەر لێك جیاناكاتەوە. وەك نەبوو وایە.

ئەمڕۆ (سیلاك) گەیشتووەتە ناو مۆخ. گیانی شارستانییەت و ژیانی پێشكەوتنی شەلەل كردووە.

بۆیە خەتەرترین (سیلاك) بەم جۆرەیە:

* دەزگایەکی سیلاك، بەزەلامێکی سیلاك دەسپێرن.

لەوێوە، (سیلاك)ی تەشەنە دەکات، لە دەزگاکەو بۆ کارمەندان، لە کارمەندانەوە بۆ خێزان ، لە خێزانە وە بۆ ناو کۆمەڵ، هەموو سیلاك دەکات ئیدی بە(سیلاك)ی دەگوزەرێنین. ئای لەم کارەساتە.

دژەسیلاك

## فیرۆی، رۆژنا، مه، وانی، یا... !؟

* بەفیڕۆچوونی ملیۆنان دینار یا دۆلار، کە دەیان کارگە و فابریقەی جۆراوجۆر و بەسوودی پێ دروست دەکرێ.
* بەفیڕۆچوونی هەزاران تەن کاغەز، کە ملیۆن کتێب و دەفتەری پێ دێتە چاپ و بەسەر هەزارن قوتابیی هەژاری خاوەن ئەنفال و شەهید دەبەخشرێتەوە.
* بەفیڕۆدانی سەدان تەن لە مەرەکەبی رەش و رەنگاورەنگ کە دەیان دایەنگە و مەڵەوانگە و سەیرانگە و پیشانگەی لێ دەکەوێتەوە.
* بەفیڕۆدانی توانای چاپخانە و کۆمپیوتەر و لاپتۆپ و ئەنتەرنێت کە سەدان کتێبی پوخت و خارای فەلسەفی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سێکسی و سایکۆلۆژی و رووناکبیری پێ دێتە چاپ.
* بەفیڕۆدانی وزەی سەدان مولیدە و بەنزین و رون و گازی ئۆتۆمبیل کە دەیەها نەمامگە و سەیرانی لێ دەرسکێ.
* بەفیڕۆدانی هەزاران دەستەفیلمی باشی وا کە لەباری دایە گەورەترین پیشانگەیەکی فۆتۆگرافیی کوردستانی جوانی پێبکرێتەوە.
* بەفیڕۆدانی هەزاران پسوولەی ساختە و ساختەکاریی پارەپوول کە دەلوێ بناخەی چەند گوندێکی تازەی پێ راست بکرێتەوە.
* بەفیڕۆدانی هێزی بێ بنی بازووی سەدان گەنجی بەتوانستی وا کە دەیان قوتابخانە و نەخۆشخانە و کتێبخانەی پێ ئاوەدان بکرێ.
* لە پاڵیشیدا فێرکردنی نەوەی نوێ بە بەزم رەزمی ماستاوچییەتی و ملکەچی و سەرکزی.لەپاڵیشیا دەیان دەعوەتی گومانلێکراوی شەوانەی سووری یا سپی رۆژ و مێزرازاندنەوە. لە پاڵیشیا هەڵخەڵەتاندنی کچانی بێ ئەزموون کەمدەرامەت... ئیتر، لە پاڵیشیادا، لە پاڵیشیادا. لەپاڵیشیادا.

– ئەمانەش هەر لە:

* زاخۆوە بگرە تا خانەقین.
* لە هەر شارۆچکە و شارەدێ و گوند و دێهات.
* لە هەر گەڕەك و کۆڵان و شەقامەوە بگرە تا ماڵێك.
* لە هەر وەزارەت و دەزگا و سەنتەرێك.
* لە هەر سەندیکا و یەکیەتی و کۆمەڵە و گرووپێك.
* لە هەر خانەقا و مزگەوت و کڵێسایەك.
* لە هەر لق و مەڵبەند و رێکخراو و رێکخستنێك و کۆمیتەیەك.
* لە هەر، لە هەر، لە هەر، تاد.
* ئا ئەمە چوارچێوەی پاژێکە لە سوپایەکی کەم چەکی (بەناو) ڕۆژنامەنووسی بێ ئەزموونی هەوێر نەشێلراو، یا کەم ئەزموون و کەم بەهرە، یا هەر نەزان و بینکورتی وا کە تەنیا لای من (٧٥٧) ڕۆژنامە و گۆڤار و عینوان کەوتووەتەوە و ڕۆژ دوای ڕۆژیش لە زاوزێدایە. ئەمەیە دیفاکتۆی دەسکرد و دروستکراوی کارەساتی ڕەوتی ڕۆژنامەوانیی ئیمە، های لە ئێمە کە بەحەز و گزوفتەوە دەخوازین وێنەی حکوومەتێکی سیستەماتیك و کۆمەڵێکی مەدەنی بکێشین لەم پارچۆڵە ئازادەی کوردستانە، خۆگەر بێت و ناوچە دابڕاوەکانیشی بێتە سەر و مادەی (١٤٠)یش لە بنەڕەتەوە جێبەجێ بکرێ، کارەساتەکە تادێ زەقتر و پەرژەنگتر دەبێ، چونکە زۆری ئەو سوپایەی کە بەتیۆریی (مەشق و ڕاهێنان) و (قیرۆسیا) خۆی خەڵەتاندەوە و تەلەفۆن و نامە و کارتی فیسار و فلان و چاوسوورکردن و گیرفان پڕکردن و بەبروبیانووی کە بەندە بەرێسای (تابەڕوو زۆربێ، سمۆرە–نەخێر میللەت. –برسیتر دەبێ) بێ بڕ، لەزێ دەدەن و لە پەرسیلەش حەلوا دورست دەکەن و لەجیاتی خونچەش دڕك دەچێنن، بەڵام وەك ئەسپ و هێستر لەقە لە یەك ناوەشێنن،

چونکە بەرژەوەندییە بەرژەوەندی.

* **برا** بەینی خۆمان بێ، ئەرێ بۆ هەموو کەرێ ئاخوڕ چێ دەکرێ.

ئاوەدان بێ هەریرە، هەر گوندێك حەڤدە میرە، هەر ئەوەندەم لە بیرە.

هەیهوو **برا** هەیهوو.

***

فیرۆکەرێك

## دەمامك، كامیانی؟

* (كەسایەتی) ژێدەرەكەی گریكییە و ڕەنگی مانای (دەمامك) دەرێژی، چونكە ئەكتەرەكانی شانۆی ئەو كۆنە ڕۆژگارانە (دەمامك) یان دەپۆشی، ئەویش بۆ شاردنەوەی خەوشی دەروونی و جەستەیی خۆیان. بەم پێیەش ئایا دەبێ (كەسایەتی) دەمامكی دەرەوە نەبێ، بۆ پەردەپۆشكردنی رازە شاردراوەكانی ناخی ناخ.

یاهەر خۆی لە خودی خۆیدا جۆرێ نەبێ لە جۆرەكانی هەڵكردن و ڕامبوون لەگەڵ دەوروبەر؟

یا جۆرە (دووفاقی) و (دەفاقی)یەكی دەروونی نەبێ، یاچەشنە شیزۆفرینیایەك كە هەرە زۆری مرۆڤ بەبالآیدا بڕاوە و هەستی (من) و هەستی (دەمامك)یش لەملەملەیەكی بێئاماندایە لەگەڵی. ئەی ئەوە نییە: سیاسی و دەمامك، وەزیر و دەمامك، پەرلەمانتار و دەمامك، شاعیر و دەمامك، هونەرمەند و دەمامك، قۆنتەراتچی و دەمامك، نووسەر و دەمامك، موڵكدار و مەزرەعەدار و دەمامك، مامۆستا و دەمامك، مەلا و دەمامك، قاچاخچی و دەمامك، بازرگان و دەمامك، ڕۆژنامەنووس و دەمامك، بێژەر و دەمامك، ڕاوێژكەر و دەمامك، دەمامك، دەمامك، دەمامك.

* هەر لەم بارەیەوە مامۆستای دەروونناسی لە زانستگەی (نانتێر)ی فەرەنسی، پرۆفیسۆر مارشاڵ دەڵێ: «كەسایەتی واتە: سەرنڤیشكی هەڵسوكەوت و ڕەفتار و جۆری بیركردنەوە و هەڵچوون و خووورەوشت و ساز و سەوداو هەڵوێستی تایبەتی مرۆڤە لەگەڵ ژیان و بۆ ژیان،» دیارە هەر مرۆڤێكیش خاوەنی كەسایەتیی سەربەری خۆیەتی و پێوەی لكاوە و جۆری تایپ و ستایلی، لە یەكێكەوە بۆ ئەوەكەی دی دەگۆڕێ، واتە: دەمامكێكی تر. دەمامك.

* لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا، سایکۆلۆجیا لە بنەڕەتەوە و لە لێتوژینەوە چەشناو چەشنەکانیدا پەی بەگەلێ سایکۆفیزیکیی مرۆڤ بردووە و ئاشکراش بووە کە: ناخ و دەروونی مرۆڤ – هەر مرۆڤێ – بەندە بەو لیك و شلەمەنی دارژاوەی بایۆکیمیاوییەوە کە لە ئەنجامی هەڵچوون و داچوون و گرژی و سروشت و مۆرك و ئاکارەوە سەرهەڵدەدا و بەمەش جۆرە (دەمامك)ێك دێتە ئاراوە.
* بەڕاستی: لە پشت پەردەی گەمە و جەفەنگی ڕوخسار و ڕەفتار و دەمامکدا، بەشێوەیەکی گشتی (٣) تایپی کەسایەتی خۆی لەمەڵاس ناوەو دەزووڵە دەکا:
* کەسایەتیی قاوغە گرتووی سندمکراوی سەرکڵومی خانەبێزار و دوورە پەرێز و لاتەریکە و زۆر بەند نییە بەچەپەر بەندان و بەدەوروبەرو بەکۆمەڵانی خەڵکەوە، زیاتریش ڕووتاڵ و بایەخ بەهەست و سۆز و کێشەی کەس نادا، سایەوشك و سیخناخە بەڕق و کینە.
* کەسایەتی ڕەشبین، کە جۆرە ئاکارێکی سەخت و توندی لەگەڵ خودی خۆی و خەڵك هەیە و (منمنی) خۆیشی تاکە دەسەڵاتی بالایەکەیەتی: فەرمانی لەسەر دەکا و کاری ڕۆژانەی بۆ ڕێك دەخا و خۆهەڵشرێنگینەرە و حەز دەکا بیروباوەڕی خۆی بەزەبری کوتەك بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ، ڕەشە ئاینخواز و بەرژەوەندساز و پرەنسیپەکانی ڕەوشت لەلایدا زۆر زۆر گرنگە، سەرقۆزی بن ئاڵۆزە و دوودڵ و ڕاڕایە و لە بریاردانیشدا نیگەرانە و دەمامکەکەشی زۆر زەقە.
* کەسایەتیی (والا)ش، مرۆڤێکە خاسەڕەنگەکەی خۆشراوێژیی لێ دەبارێ، بەهێزە و هەمیشە ئامادەگی خۆی هەیە و دەمگەرم و ڕاستاڵ و بەخشندەیە، ڕووبەبەخەندە و دەبەخشێ و مایەی سەرنجدانە، لە بواری پێوەندیی گشتیدا زەرناس و لەبەرچاوە.

*دەی دەمامکەکە داماڵە و بزانە لە کامیانی، ئەگەر لە هەرسێکیان نەبووی. ئەوا دوور نییە لە ئامێزەنی ئەو سێیانەوە دەمامکی چوارەمت بەرکەوێ.

# ئارایشتگە بۆ خانمە

چ باری ئاڵۆز و بڵۆزی دەروونی و چ تەمەن و چ کەشوهەوای سیاسی و بازرگانی و ئابووری، هەر زۆر کار دەکەنە سەر ڕوخسارە دە ڕووەکان و ناخە کرمنەکان و زۆریش گۆڕان و مۆڕانی بەسەر دادێ و دەیشێوێنێ، بۆیە وا چاکە و شیاوترە ئەی خانمە ڕووڕەشەکە: بەبزەی فێڵاوی و بەماکیاجی گەچڵاوی و بەچاویلکەی تەماوی، ئەو ڕوخسارە پڕ لە شوورەییە، نەختێ هەر تۆزە نەختێ – ئەگەر ویستت – گەشتر بێتەوە و شەوانی ویسکی و ڤۆدگا و کۆنیاکی پێ برازێنێتەوە. ئەوا:

١– پارچە پەڕۆی کورتانی کەری دەسەڵاتدارێکی قرخن یا سەرمایەدارێکی لیخن و میزاویی یەکێکی وەك خۆت، تەڕ بکە و بۆ ماوەی (٥٠) چرکە بیخە سەر ڕوخسارەکەت، بەڵام بەمەرجێ لەسەر حەوزی نێو ڤێللای ڕەز و باخێکی گومانلێکراودا بێ.

٢– ئەگەر ویستت – مەرجە – لەککە و قۆنێرەکانی مەمکت، نینۆکت، لاڕانت، ناوك و کەفەڵ و نافەت لابدەی، ئەوا: هەندێ دڵۆپە فرمێسکی کیژۆڵەیەکی نەوڕەسیدەی لانەوازی هەڵخەڵەتێنراو، تێکەڵاوی چەند لیك تفی قارچکە دەوڵەمەندێك بکە و فینجانە ئاوێکی ڤیاگراش بەسەردا کە، ئینجا بەکلینیکس یا بەچەمچە بۆیاغی فیلیك بیساوە و دەس بکە کیبۆردی دڵت و ویندۆزەکانی دەروونت واڵا بکە و بەکۆمپرێسەریش ڤایرۆسی چەمەنتۆ ژەنگاوییەکانی ناخت هەڵکەنە و بەفڵچەش فلینکۆتی لێ دە تا جارێکی تر درزەکانی زووخاو دەرنەدا و فۆڵدەرەکانی ڕەش دانەگەڕێن... ئەمەشیان تەنیا دەسپێکی پاگژبوونەوەتە، نەك یەکبارەیی.

ئارایشتخوازێك

## مانگاکان یا کەرەکان

ئەم ورکەی تیژڕەوەش لە هاورازێکی خۆ ماسا دەرچووە، (کەر)یش لە باتی (مانگا)

ئینتەرنێت دەفەرموێت:

– ئیشتراکی: واتا تۆ دوو مانگات هەبێت، یەکێکیان بدەیە دراوسێکەت.

– شیوعی: واتا دوو مانگات هەبێت و حکوومەت هەردووکیانت لێ بسەنێت، بەڵام تۆزێك شیرت بداتێ.

– نازی: واتا تۆ دوو مانگات هەبێت. حکوومەت هەردووکیانت لێ بسەنێت و ئیعدامیشت بکات!

– کۆمپانیای ئەمریکی: لەو دوو مانگایەی هەیە. یەکێکیان بفرۆشیت و ئەوی تریشیان ناچار بکەیت، شیری چوار مانگات بداتێ.

– کۆمپانیای هیندی: دوو مانگات هەبێت و تۆ بیانپەرستی.

– کۆمپانیای بەریتانی: دوو مانگات هەبێت و هەردووکیشیان شێت بن.

– کۆمپانیای تورکی: واتا دوو مانگات هەبێت، هەردووکیان ببن بەگۆرانیبێژ.

– کۆمپانیای ژاپۆنی: دوو مانگات هەبێت و لەرێی زانستییەوە دەستکاریی جیناتیان بکەیت، تاکو شیری ٥٠٠ مانگات بدەنێ.

– کۆمپانیای بەعسی: دوو مانگات هەبێت و یەکێکیان بکەیت بەجاسووس بەسەر ئەوی ترەوە.

– کۆمپانیای سویدی: دوو مانگات هەبێت و چاودێریی بکەیت بۆ ئەوەی مافەکانیان وەکو مرۆڤ پارێزراو بێت.

- کۆمپانیای ئەفریقی: دوو مانگات هەبێت، یەکێکیان لەبرسا بمرێت و ئەوەی تریش بەهۆی ئایدزەوە.
- کۆمپانیای کوردی: دوو مانگات هەبێت، یەکێکیان بەهۆی گەرماو بێ کارەبایی، هەوڵ دەدات خەتێکی کارەبای قاچاخ لە ماڵی شێری دراوسێیان بدزێت چونکە ئەوان کارەبای بەردەوامیان هەیە، بەڵام حیمایەکانی شێر دەیگرن و پڕ شەقی دەکەن. مانگاکەی تریشیان، لەرقی وەزارەتی کارەبا بەشداریی خۆپیشاندانێکی مانگاکان دەکات و ئەو دروشمە دەڵێنەوە:

چیتان دەوێ مانگاکان؟

کارەبا بۆ ماڵەکان

ئێوە چین و چیتان دەوێ؟

مانگاین،. کارەبامان دەوێ

بەڵام مانگا نارازییەکە بەوە تۆمەتبار کرا کە چاوی بەو هەموو کارو خزمەتگوزارییانە هەڵنایەت کە حکوومەت بۆ هاووڵاتییانی دەکات!

مانگای یەکەم، لەداخا دەبێ بەئەندامی بزووتنەوەی حەماس و تەقە لە مەڕەکانی ئیسرائیل دەکات.

بەڵام مانگای دووەم، بەهۆی ئەو تۆمەتانەی حکوومەت، تووشی نەخۆشیی دەروونیی دەبێت و دوای ماوەیەك لە خەفەتا دەمرێت، هەواڵەکەش وا بڵاو دەکرێتەوە گوایە بەهۆی خراپیی ڕۆنی بایەعییەکەوە مردووە.

## که ئافرەتێکت دی

پیاوی جۆکەر و نەوسن و بەمۆزە مۆزی ئەم ڕۆژهەلاتە، ئینجا پیاوی دا نەمرکاوی ئەم کوردەوارییە، چ بەش و شوێنێك لە لەشی ئافرەتێك کە بۆ یەکەم جار دەبینێ سەرنجی ڕادەکێشێ و ئەڵهای دەکا؟ چاوی، لێوی، لاقی، سمتی، کەمەری، قژی، ڕەوتی، بەژن و بالای، تاد، تا، تاد،؟ دەی دەگوێ لە ڕای ئەم ژن و پیاوانە بگرن:

* مەلایەك: چی بڵێم، بەلام دەڵێم، «نساؤکم حرث لکم، فأتوا الحرث أنی شئتم.» صدق الله العظیم
* پرۆفیسۆرێکی زانکۆ: ناز و فیزی و چاوترووکاندنی، بەژن و بالای
* پزیشکێك: سەر دڵی و گۆپکەی مەمکی سرکی
* ئەندازیارێك: هەموو میعماری لەشی
* قەیرەکچێك: هەموو جەستەی، نەخازە: سمتی، لاقی، لووتی، مەمیلەی بەرەڵلای
* کۆندۆمە قۆنتراتچییەك: هەر هەمووی، هەر هەمووی، هەر.
* کچە شێوەکارێك: بەژن و بالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە، نەرمەی ڕانی
* نووسەرێك: چاوە خەواڵووە قووڵەکەی، ئاخ لە کچی جۆکەر.
* شاعیرێك: چاوە مەیخانەییەکەی، مەمکۆڵەی، برۆی.
* چیرۆکنووسێك: چیرۆکی یەکە یەکەی هەموو جەستەکەی.
* ڕەخنەگرێك: لووتی لەخۆباییم بەدڵ نییە، نابێ وابێ، دەبێ وابێ.
* سازژەنێك: ڕیتمی ڕەوت و ڕۆیینی کەورەفتاری.

* رەوەزوا (نێك): هەموو ڕەوەزێکی سەختی لەشی.

* بێ هەڵوێستێك: بەرامبەر هەموو پارچەیەکی لەشی بێ هەڵوێستم.

* مەبەستکەرێك: چاوی بەچاوچاوانێی، مەمکی، سمتی.

* سۆفییەك: استغفرالله، روحەکەی، ڕوخسارەکەی، چونکە جوانی خوای تێدایە.

* جۆکەرە بێوەژنێك: ئاخەئاخ و مشەمشی سەر سیسە مم دەخاتەوە.

* سەرۆکێك – بنۆکێك: هەم سەری هەم بنی.

* گۆرانیبێژێك: خۆشتر لە ئاوی زمزم حەجاجی دەچنە سەرێ.

* عاشقێك: موحیبەت ئێشی زۆرە ڕێزی لێ دەگرم.

* دەرهێنەرێك: خۆزیا ئەو من دەربهێنێ.

* دزێك: لە نیوەشەودا لەبن دالانێك.

* بەرپرسێك: قوربانی ئافرەتی سکرتێر بم.

* پەرلەمەنتارێك: مێینە تارێك.

* زامدارێك: هەموو زامەکانی لەشی.

# قاشقاشێن

بەر لە (٥٠) ساڵ ئەم زەرەهاوارە لە نووسەرێك هەڵساوە.

(قاش) (قاشکردن) و (قاشقاشێن) بەڵام جۆرە (قاشێکی) تایبەتە. ئەگەر شتێك لەم (قاشقاشێنە)ت نەبیستبێ دوور نییە بە(قاشی) شووتی، خەیار، ترۆزی یا کاڵەك بیدەیتە قەڵەم. ناحەقیشت ناگرم چونکە ئەم (قاشە) تازە داهاتووە نە (قاشی) شووتییە و نەکاڵەکیشە، بەڵکو (قاشی مرۆڤە) هەندێ لەو کچ و ژنانەی کە گاڵتەیان بەخووورەوشتی جوان دێ، یەکتر (قاش دەکەن) ئەم کچە (قاشی) ئەو کچەیە. ئەو دوو کچە (قاشی) یەکترین، ئیتر مەپرسە لە حاڵیان هەموو شتیان لەبیر دەچێتەوە تەنیا (قاشقاشێنەکەی) خۆیان نەبێ. لاساییکردنەوەی یەکتری لە رەنگ و درووونی جلوبەرگ. لە بـڕیـنـی قـژی سەر. لـە پـێڵاو لـە قسەکـردن. لـە ڕۆیشتن. لـە هـەموو شتێك، قوربەسەر ئەو کچەی بەسووسەیەك بەخراپە ناوی (قاشی) یەکێکیان بەرێ، بەخوا ئەم دنیا گەورەیەی لێ دەکەن بەکونەمشك، خۆکە گەیشتنە یەك وەکو دەساڵ یەکتریان نەدیبی وایە. بەسەر یەکا دەنووزێنەوە و دنیا پڕ دەکەن لە (گیانەکەم) کە قاشەکانی تر پێیان بڵێن: خوانەیبڕێ (قاش) هەروەکو فلان کچ و فیسار کچ دەبێ. یاخوا لە چاوی بەد بەدووربن. کە بەیەك دەگەن دەڵێی: کۆترە باریکەن و بەدەم یەکا دەرشێنەوە. جا گەر ئەم (قاشقاشێنە) خۆشەویستییە زۆر باشە؛ چونکە خۆشەویستیی ڕاست، عەقڵ ڕابەریەتی بەڵام (قاشقاشێن) هێزی ئارەزووی ڕەگەزییە. جا بۆ ئەوەی ئێوە هەموو خـوشکـی یـەکـتـر بـن بـەربـەرەکـانـێ لـەسەر شتـی پـڕوپـووچ مـەکـەن. ئـەو پێویستییە پیرۆزانەی کە لەسەر شانتانە لە بیرتان نەچێتەوە بۆ ئەوەی خووورەوشتی پاکژتان بپارێزن، لە لەککە و چرپەچرپ و سووسەی ئەم و ئەو، پێویستە دوورکەونەوە لە (قاشقاشێن) و (قاشکەران).

## پانۆرامای قانوونی مەرگ

کەرێك، کەرێکی وردبین و دنیادیدە و عەبەسی، باسی عەبەسییەت و بێهوودەیی وجود دەکات دەڵێ: "کاتێ کە مرۆڤ دەمرێ! ئای مردن! لە پێشدا خوێنەکەی دەبزرکێ و دەگەنێ و خرۆکەکان زیواڵ زیواڵ دەبن و هیمۆگلۆبینەکەی دەردەفرتێ و دیواری شادەمارەکانی دەرەنگێنێ و ئینجا وردە وردە دوویەدەری دەکات و ڕیشاڵەکانی دەوروبەریشی ڕەنگاڵ ڕەنگاڵ دەبێ، دوای ئەوەی غازی هایدرۆجین لەگەڵ ماددەی ئاسندا یەك دەگرنەوە و (کبریتە سەوزەی ئاسن)ی لێ دروست دەبێ... کە تێکەڵی هیمۆگلۆبینیش دەبێ. کبریتی هیمۆگلۆبینی ڕەنگ قاوەییی لێ پەیدا دەبێ، جا دەمارە خوێنینەکانی ناوچەی ڕیخۆڵەکوێرە، [وەك] گەڵای زەردەرەختێکی بەلقوپۆپیان لێ دێ، ڤێجا وردە وردە دەگاتە دیواری زگ و سینگ و قینگ و شان و مل و ناوگەڵ و سەراپای لەشی مرۆڤ دادەگرێ، نێر بێ یا مێ، قانوونی مەرگیش نێر و مێی نازانی.

تەنیا لە مەرگا، ژن و پیاو یەکسانن.

لە پاشا شانۆچکەکانی لەش، شیی دەبنەوە و دەتەقن و شلۆکەکان لە ژێر توێژاڵی پێستا بەشێوەی کەفەژیلە و بڵق کۆ دەبنەوە و، لەوێشەوە بەهۆی فشاری غازە بۆگەنەکان هەمدیس دەتەقنەوە و بەمەش گەلێ بەشی لەش لە توێژاڵەکەی جیا و ڕووت دەبێتەوە، ئەو (بڵقانە)ش بڕێتییە لە شلۆکێکی بزرکاوی بۆگەن و گەلێ غازی جیاجیای وەکو کبریتۆری هایدرۆجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و نۆشادر و هایدرۆجین و مەسین دەبزرکێنێ

بزرکان بەردەوامە جارێ کیسەی گون و ڕاڕەوی قوز دەپەنمێ و پف دەردەری،، گونی گەورە و قوزی بەلووری، ئەوجا زگ و دەم و چاو، چاوی کەژاڵ و لێوی ئاڵ! لەپاشا هەردوو گلێنەکە، ڤێجا زمان (زمانی لووس)

شۆڕ دەبێتەوە، ئینجا قژ، قژی کاڵ، ئەوجا نینۆك، نینۆکی درێژ و بۆیەکراو، لە پاشا لەهێکڕا هەر هەموو لەش، لەشی نەرم و نیان! تێك دەچێت... لەو ساتانەدا زۆر زەحمەتە ئەو مرۆڤە بناسیتەوە یا شێوەی بکەیت.

غازەکان بەردەوام دەزریکێنن، شالاو بۆ ناو ورگ دەهێنن، چڕەبەڵغەمێکی زۆر پیس و بۆگەن، لە کونە لووت و لێواری دەمدا پەیدا دەبێ و لەپاشا تنۆك تنۆك دەچۆڕێت، هەمدیس غازەکان هێرش بۆ مەعیدە دەبەن و هەموو گەن و گووەکان لە دەمەوەو دەدەر دەن، یا بۆ بۆرییەکانی هەناسە پاڵیان پێوە دەنێن و بەمەش ڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی شێوانی یەکجارەکی دێتە ناو نمایشەکە، هەر ئەمەیش هۆرووژم دەباتە سەر منداڵدان و سەری منداڵی مردووی نێو منداڵدانەکە لە ڕێ پزدانەوە تووڕ دەدات، بزڕکان بەردەوامە! تا بەجارێ سەرانسەری لەش، دەبی کونگەهەوێرێکی شلەپەتەی بڵ و لە پڕیکا دەتەقێتەوە و شلۆکێکی یەجگار بۆگەن، لە نێو بۆشاییی سینە و ورگدا کۆ دەبێتەوە و دڵ و گون و چاو لە سمت و دەس لەگەڵ و لێو لە مل و ڕان و گەردن، جیا ناکرێتەوە و! تەواو.

سەرنج: ئەم دەقە جارێك و دوو دە جار بخوێنەوە بەوردی زۆر بەوردی، سەیرێکی ئەم پانۆڕاما سوریالییە سامناکەی قانوونی مردن بکە، گەشتێکی کارامە و زیرەکانە لەنێو جەستەی مردووێکا بکە، ئینجا بڕیار لەسەر ڕەفتار و کردارت بدە!! تا لەنێو گۆڕی تاریکدا یەك دەگرینەوە، خواتان لەگەڵ.

# سەرنج و ئاگاداری

خوێنەری ئازیزۆکە:

بەپێی یاسای بەرفراوان و کەرانەی (کەریزم) و کەری (داهێنەر)و دەبێ، بەڵێ دەبێ بمبەخشی، گەر هەندێ بێ ئەدەبی و بێ ویژدانیشم لە ڕووی هەندێ لە زلکورتانەکاندا کردبی خۆ منیش یەکێکم لە ئێوە، ئەوەی خۆیشی لە نێو ئەم کەرنامەدا (ئەدۆزێتەوە) ئەوا موژدە و مزگێنی (پاکبوونەوەیەکی گەورە) ببەخشێتە خۆی و پیرۆزە. با کەسیش شك لە خۆی نەکا (عەجایب) و دەردی قەنقەلاشکەکەی بەسەر نەیەت باوەڕیش ناکەم کەس بە(دەنگی مێژوو) بڕوا نەکات و بەزەڕینی کەر (متمانە) بهێنی.

بژی کەرایەتی

شکۆدار بێ کەربازاڕی.

ژێدەرە کورتاندارەکان:

* کەرایەتیی خۆم و ئێوە.
* کەرایەتیی کەر و جیهان.
* کەرایەتیی شارستانییەت و سیاسەت و مێژوو.
* هەندێ شڕە کتێب و نووسینی گەچڵاوی کەردۆستەکان.
* پێنج شریتە دەنگی زەڕینی کەرپیاوەکان، لەگەڵ دوو سیدی DVD و یەك کاسێتەڤیدیۆی کەربازاڕی.